(نوبەت)ی (تفسیر)ی (سورە)تی (نوح)ە (علیە السلام)با (عرض)کەین (سید البحار)یا پێی بڵێین: (استاد)ی (البحار)آن (مناسبە)ی زۆر (ظاهرە)لەگەڵ (سورە)تی (سابق)(وجوە)ی هەیە؛ کەسێ چووبێتە ناو (سفینە)ی (جاریە)زوو ئەیان زانی مکی یە بالاتفاق عددی آیاتی خلافی‌یە لە (٢٨)کە متر نیە لە (٢٠)زێتر نیە.

بسم الله الرحمن الرحیم

(الهی)(مسڵمان)آن لە (طوفان)ی (حرب)ی (حاضرە)(و لا تذر علی ارضهم من الآوروپین دیاراً)﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا﴾ (نسب)ی وەکی لە (تورات)دایە (ابن لامەک)(ابن متوشـخ)(ابن اخنوخ)(ابن یاود)(ابن مهلهل)(ابن فینان) (ابن انوش) (ابن شیث)(ابن آدم)(علیە السلام)، (لکن حقیقەت)ی (حاڵ)خوا ئەیزانی (تاریخ)لەو (ایام)ی نەبوە وەکە بوو (مضبوط)نەبوو (مع الأسف)حالاً (تاریخ)ی نسبی لە ناو کوردان نیە لە سەدانەوە ناوی باپیری و بابی باپیری نازانی (تاریخ)ی (ولادەت)هیچ ئیخۆشی نازانی (عربی)نیە لە (نوح)بە (معنا)گریان و زاری نیە (سید)(قول)ی (حاکم)پەسند ناکا (و کذا سبب)ی (نوحی)وا دیارە ئەوە لە (طرف)ی (اشتقاقیون)آنە وەکی (احمدی ئایشۆکێ) (خوا عفوی کا) ئەیگوت (پێمەرە)بە پێ برە (پێیا نۆک)(پێ باوی وە زووکە)ئەڵێن: (اسمع بائیل)(ماخذ)ی (اسماعیل)ە ﴿إِلَىٰ قَوْمِهِ﴾ ئەگەر (بشر)(منتشر)بووین لە (آسیا)و (ئاوروپا)و (افریقا)بوون با باسی (ئەمەریقا)ی نەکەین؛ (مراد)لە (قوم)ئەوانەن کە لە ناویان بە (ولد)بووە وەژیوە یەکێ ئەڵێ: (سکان)ی (جزیرةالعرب)یەکێ ئەڵێ: (أرض)ی (کوفە)بە (مناسبە)ی (جود)بایەکێ بڵێ (جزر)ی کوردان (ابو الأقوام)ە (ارسال)ی (رسول)لەو (عصر)ی بۆ (اهل)ی (أرض)هیچ (وجە)و (معنا)ی نیە ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ﴾ (سبحان الله)هەرایەکیانە لەسەر ئەو (ان)ە کردێتینە گێڕاوێ مەگەر (نوح)(نجی الله)(انسان)ی لێ (نجات)دا ئەگەر (ابنمسعود)لە دوای

ئەو (نحوی)یانەبا ئەم ووت: لە ڕقی وان (من)ی (حذف)کردیە، ئەی (نوح)(انذار)ی (قوم)ت بکە ﴿مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بە ئێش و ژان ﴿قَالَ﴾ (حضرەتی نوح)فەرمووی: ﴿يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ﴾ بۆ (نفع)ی ئێوە ﴿نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ (آیات)ی (الە)یتان بۆ (بیان)ئەکەم بە (واضحی)و ئاشکرایی ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ﴾ (وحدە)﴿وَاتَّقُوهُ﴾ خۆی لێبپارێزن بترسن ﴿وَأَطِيعُونِ﴾ ئەوەی من پێتان ئەڵێم: بەجێی بێنن چ (فعل)چ (ترک)﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾ (بعضاً)(جناب)ی (حق)(آیەت)ێ (کلمە)یە ئەهاوێتە مەیانە ئەبێتە (باعث)ی (إضطراب)ی (نظار)آن یەکێ لەوانە (من)ی ئێرە یە، ئەگەر لە (عبارەت)دانەبایە بە (راحەت)(تفسیر)یان ئەکرد وە تووشی (سؤال)و (جواب)نەدەبوون و (صاحب الرسالە)ئەفەرموێ (الإسلام یجب ما قبلە) (قتل)(حقوق)ی خوا (حقوق)ی (عباد)(الآن)شتەکم بە (خیاڵ)داهات با (من)(تبعیضیە)بێ (مراد)ئەو گوناهانەی (اثر)یان نایەتە (حاڵەت)ی (اسلامیەت)خوا لێیان خۆش دەبێ (بلاقید)و (شرط)ئەوەی (اثر)ی هەبێ لێیان خۆش نابێ بە(مجرد)ی (ایمان)هێنان ئەبێ (اثر)ی ببڕێ (مثلاً)یەکێ لەوان (نکاح)ی خوشکی کردبوو کە(مسڵمان)بوو ئەبێ دەست لە ئافرەتەکە هەڵ گرێ (والا)لێ خۆش بوونی نیە. (سید)(تفصیلات)ێ زۆری هەیە (علی کل حال)(اعتبار)بە (قول)ی (اخفش)مەکەن، ئەڵێ (من)(زائد)ە وە(ممکن)ە لە (شریعەت)ی (نوح)(علیه السلام)بە (ایمان)(حقوق)ی (عباد)(عفو)نەکرابێ (حظ)لە (تفصیلات)و (مجادلە)ئەکەی؟ بنۆڕە (روح المعاني)وە (ممکن)ە بڵێین: کەسێ هۆشی بێتەوە بەرێ لێخۆش بوونی (بعض)ێ گوناە (کافی)یە بۆ (دەعوەت)ی (الإیمان)وە(قبول)ی وی بۆ ئەو (دەعوەت)ە ﴿وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ (اجل)ێ (مدە)یە (طویل)(علی تقدیر)ی (ایمان)هینانیان یاخود (مراد)وەیە هەر کەس وەکی (سائر)ی (ناس)بە مردنی خوی امری ناتا نبرپینیتەوە بە(عذاب)ی (عام)لە (صغار)و (کبار)و بێ ناوو پیر

(ممکن)ە (اعقاب)تان بمینێ (الی الآخرة)﴿إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ﴾ ئی (ملی)ئی (شخص)﴿إِذَا جَاءَ﴾ کە هات ﴿لَا يُؤَخَّرُ﴾ (تاخیر)ناکرێ (اما)ئەگەر (ایمان)بێنن (ممکن)ە بڵێین: (طوفان)نابێ یاخود لە (سفینە)ی لە (سفائن)ی (عدیدە)(باذن الله)(نجات)تان ببێ. وا مەزانن هەر (قوم)ێ یا هەر (شخص)ێ (مسلمان)بێ لە (آفات)ی (عمومی)قورتار ئەبن بە (مجرد)ی (ایمان)بەڵکوو بە (ایمان)ێ (مبالغەلی)زۆر جار (مؤمن)ەکان تووشی (بلا)یە ئەبن (کافر)ەکان تووشی نابن ئێمەش وەکی جوولەکان بە تەماین خوا لە (آفات)آن چە پاڵەماندا بێ (زەحمەت)ی ئێمە بە هە ناسە بایە دوشمنان بفەوتێنێ. (ملا)یانی ئێمە (اختلاف)یان هەیە (اجل)یەکە یا دوو؟ بەڵی ئەوەی (واقع)دەبێ یەکە (اما نظر)بە (احوال)ی (ظاهرە)لە (قوەت)و (ضعف)وە بە (امور)ی (خارجە)لە خواردن و (عمل)کردن (اجل)دووە (یعنی)(قابل)ە (انسان)ێ سەد ساڵ بژیە (لکن بشرط)وەکی ئەوانەی (سیغۆرتە)ئەکەن لەو ڕۆژانە باران زۆر باری ئاوی زێیان (طغیان)ی کرد (تخریبات)ی زۆردار (حتی)پردی سەر (غازی)برد. (مع أنە نظر)بە (متانەت)ی (قابل)بوو بە دووسەد ساڵ (قید)ێ نەکا. یەکێ لە (علما)ی (طبیعەت)ئەڵێ: قسە لە (حیات)ئەکا تا ئەمرۆ کەس بە (موت)ی (طبیعی)نەمردیە ئەو نەساغی (انسان)پێی ئەمرێ وەکی (قتل)وایە (غایەت)ی لای (عامە)(آلەت)ی بزرە، چووزانن (میقرۆب)لە دەروونی (تخریبات)ئەکا؟ تاڕای دەقەنێنێ! ﴿لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بزانن یا شتێ بزانن ئەتانزانی (اجل)کە هات ناگەڕیتەوە کێ (مقابلە)ی خوای پێئەکرێ؟ (اجل)ی وی (تاخیر)کا. هەر چەند (علما)ی (حیات)خەریکی (امتداد)ی (حیات)ن، (لکن)(سیاسەت)و گرانی (معیشەت)کە (انسان)(مجبور)ئەکا (مشقەت)ی بۆ بخوا (کشف)نەبوونی (بعض)ێ بۆ (مقرۆب)(امل)یان تێکئەدا، (حقیقةً سیاسەت)(دنیا)ی ویران کرد، نێزیکە بە ڕۆژی لە (ساحات)ی (حرب)(ملیون)ی (نفس)(ضایع)بێ (واقعاً)غەمی

(حکما)یەکانی (محب)ی (بشریەت)مە، ئەوانیش زۆر(متاثر)ن ﴿قَالَ﴾ پاش (طول)ی (دەعوەت)و (مرارەت)چێشتن و (صبر)و (ثبات)(تحمل)ی (مشاق)ی جان فەرسا ﴿رَبِّ﴾ خوداوەندا،پەروەر دیگارا ﴿إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا﴾ شەوو ڕۆژ (دائم)و دەرهەم ﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا﴾ لە (قبول)کردنی فراری قلبی و عنادی ﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ﴾ بە (ایمان)هێنان ﴿جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ﴾ (انە)هەموو ئەنگوستیان ئەهاویشتە ناو گوێیان (مبالغە)یان ئەکرد لە کونە گوێ گرتنی خۆیان ﴿وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ﴾ (لباس)یان بە سەر خۆدا دێنا (کانە)لە جل و جۆری خۆیان (طلب)ئەکرد دایان پۆشی (خلاصە)ئەیان (کرهاند)گوێیان لە قسەی بێ ئەیان کرهاند ببینن ﴿وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا﴾ (اصرار)یان ئەکرد لەسەر (کفر)و گوناه خۆیان بە گەورەتر ئەزانی لەوەی (اتباع)ی من بکەن ﴿ثُمَّ﴾ (بعدهذا)﴿إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا﴾ بە ئاشکرا بە دەنگێ بلند بێ (خوف)و ترس ﴿ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ (خلاصە)(علی الدوام)؛ (دەعوەت)ی ئەفەرموون، بە(جهر)و (سر)بە شەو و ڕۆژ ﴿فَقُلْتُ﴾ (لهم)﴿اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ﴾ خوای خۆتان ﴿إِنَّهُ كَانَ﴾ (و لا یزال)﴿غَفَّارًا﴾ (الان کان کما کان)﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ بارانتان بە سەردا دەنێری بارانێ بە(سیلان)بە (نفع)ئاوی پێ بژیەتەوە سالی گرانی (٣٦)ی پاش پەلە یەک (دفعە)لە (آخر)ی (کانون)ی (اول)بارانیک باری ئیتر تا بارانی پەلەی سالی (آتی)باران نەباری لە لایە (مصیبەت)ی (حرب)و شکستی (دەولەت)لە لایە بێبارانی کەم (رزق)ی (تکالیفات)ی حکومەت (خیانەت)ی (مامورین)لە (ارزاق)ی (عسکری)(دنیا)ی کردە (حجیم)(نعوذ بالله من غضبە)(سبحان الله)ئەوێ ڕۆژێ (انگلیز)و (فرەنسە)لە چ (حال)ێ دابوون ئەمڕۆ لە چ (حال)ێ دان؟ (یا محول الحال حول حالنا الی احسن حال)هەر توو لە (قرار)ێ ئەمێنی ﴿وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ﴾ بە (انواع)ی (مال)(نامیە)و (جامدە)﴿وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾ جۆ و جۆبار باغات دانێن ببنە

(صاحب)ی (مقصور) و (جنان)و (غلمان)و (حور)کە باران بوو (حاصلات)بە (برکەت)بوو، (هوا)بێ (علەت)بوو، (نفوس)یش زۆر ئەبێ وەکی (المان)بە (ظرف)ی بیست ساڵەکەی نفوسی ئەوەندە زۆر بوو (اصل)ی ولاتی خۆی جێی نابیتە وە ئەوا (انفلاق)ئەکا (شرارە)بۆ (اطراف)ی (کائنات)ئەهاوێ؛ وەکی شەرغەمێش بۆ ئەم لاو و ئەولا ئەچێ وا دەرئەکەوی لە (زمان)ی وی (فحشیات)ی زۆر ناشیرین نەبووبێ وەکی (اقوام)ی (متحدن)آن نەبوە ساڵێ لە (موصل)بووم (أعضا)ی (مجلس)ی (عمومی)بووین ڕۆژێ لە (طرف)(مدیر)ی (زراعەت)(بعض)ە (اوراق)یان هێنا لە (مجلس)خوێندرایەوە قسەیە خۆشی تیا بوو ئەز (جملە)ئەیووتک پارو پێرار بارانی ئەگرتەوە ئەم دیت (مسلمان)آن لە (خدمەت)شێخی (رضوانی) لەسەر (تل التوبە)نوێژە بارانیان ئەکرد ئەگریان ئەپاڕانەوە منیش ئەم ووت: ئەی (عباد)ی خوا ئەگەر خوا بفەرموێ: ئەوزێ یەگەورە (یعنی دجلە)بە بەر دەمتاندا دادەڕوا بێهوودە (خسار)ئەبێ (ماکینە)یە نایەنن ئاو هەڵکێشێ (مزروعات)ی پێ ئاودەن شەرمێ ناکەن ئەپاڕێنەوە (دعا)ئەکەن؟ بەڵێ (قوم)ی (تەنبەڵ)و بێ(صنایع)ئەیەوێ هەموو شت بێ(مشقەت)خوا بۆیبکا لەو (انقلاب)ە ئەوەندە (ماکینە)لە (دەور)ی (دجلە)و (فرات)داندرایە مەگەر ئەو (بحرا)آنە هیشک بن دەنا پەکیان ناکەوی ﴿مَّا لَكُمْ﴾ چیە بۆ ئێوە؟ ﴿لَا تَرْجُونَ﴾ (اعتقاد)ناکەن ﴿لِلَّهِ﴾ (جل‌جلالە)﴿وَقَارًا﴾ (عظمەت)و (کبریائی)خۆتان لا گەورە نیە لێی ناترسن گوێ لە (دەعوەت)ی من ناکەن لە گوناهان ناگەڕێنەوە (سبب)ی (موجب)ی چیە؟ ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ (أساساً: تراب؛ ثم نطفە، فعلقە، فمضغە)لە (قاموس)ئەڵێ: (الطور: التارة؛)(خلق)دوای (خلق)؛ (تارەت)ێ لە دوای (تارەت)ێ جارێ لە دوای جارێ (حیوان)ی (ضعیف)و بێدەسەلات ئەگەر داکتانی بۆ (مسخر)نەکردبان لە (نجاسەت)دا دەخنکان (حتی)ئەی (بشر)(داروین)ئەڵێ: ئێوە لە (اصلی)مەیموونی بووینە

(انسان)(شکر)ی خوای بکەن لە چ (حال)ێ ئێوەی گەیاندیتە چ (حال)ێ؟! بووینە (سلطان الکل)برام ئەو (تبدل)ی (أطوار)ە ئەو (دقەت)ی (صنع)و (ایجادە)ئەو (عقل)ە ئەو (درایەت)ە ئەو (مدارک)ە بە (انتخاب)ی (طبیعی)ی (جاهل)نابێ ئەوانە (بداهەت)ی (عقل)(شاهدە)بێ (علم)و (قدرەت)ی (تام)و (شامل)و (کامل)ناین.چەند (معنا)یان لەو (آیەت)ە دایتەوە ئەوی نووسرا لە هەموان خۆشترە کەسێ ئارەزوو ئەکا بیان زانی تەماشای (تفسیر)ی (سیدی آلووسی)(یعنی)(روح المعاني)(روح اللە، روح مؤلفە)بکا. ئەی (قوم)(دقەت)بکەن تەماشای (آیەت)ی (انفسی)و (آفاقی)کەن ﴿أَلَمْ تَرَوْا ؟﴾ چاوو کۆر بوە نەتان دیتیە نای بینن؟ (تامل)ی لێ ناکەن؟ ﴿كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ﴾ چەند (غریب)و (عجیب)ە سەراسەر (آیات)ە (حقیقةً)آنزیادە (علما)ی (هەئیەت)ئەیزانن بە (نظر)(اوائل)و (اخبار)و (خیال)ی (سابق)﴿طِبَاقًا﴾ (طبقە)(طبقە)(بعض)ێ لە (فوق)ی (بعض)ێ (دەوەرە)ی دابیتەوە وەکی (علما)یانی (قدیم)ئەفەرموون: یا بێ (دەورە)وەکی (اخباریون)(قول)ی پێ ئەکەن. بە (اعتبار)ی ئێستا (منظومە) لەسەر (منظومە)وە (ممکن)ە (نظر)بە (شمس)(مناطق)ی (سیارات)بە (سماوات)(حساب)کردنی (بعض)ێ ئەفەرموون: (متوافق)و (في الحسن)و (اشتمال) لەسەر (حکم)و (جودەت)ی (صنع)وا بزانم قسەیە بێ (حکمەت)و (دقەت)نیە وە ئەوەی بە چاو ئەدیترێ (کواکب)ن، (نفس)ی (فلک)بە (معنا)ی (فلاسفە)ی کۆن نادیترێ کەسێ (نظر)کاتە (ملکوت)ی (سماوات)ئەزانی (خالق)ی وی لەگەڵ ئەو (هیاکل)ە (معبود)ە چ (نسبەت)یان نیە ﴿وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ﴾ لە مەیانەی ئاسمان ﴿نُورًا﴾ لە تاریکی شەو ڕووناکی ئەدا شەوی (هواصاف)(ليالي مقمرة)(حقیقةً)زۆر خۆشە (منظرە)ی (قمر)زۆر (جالب)ی (نظر)ە؛ (بعضا)لە مەیانی پارچە پارچەیی هەورەیی ڕەش بزر ئەبێ وەدەر دەکەوی زۆر (لطیف)ە ئەگەر بە چاوی (علمی)بینۆڕیە چیزێ

دیگەرەست ﴿وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ چرایە (عظیم)(مسافە)ی هەزار ساڵ زێتر (أطراف)ی خۆی (منور)ئەکا وە(معلوم)ە (نور)ی (قمر)یش لەمەڕ وییە (حکما)ی (عصر)ئەڵێن: (بعض)ە (شمس)ێ تر هەن (نور)ی (شمس)ی ئێمە بە (نظر)وی وەکی (نور)ی (حباحب)ە (یعنی)(گوڵەستێرە)بە (نظر)کلۆپێ گە ورەیی (کەهربا)دیارە تا (علم)ی (بشری)(زیاد)کا (بدائع)ی (صنع)ی (الهی)چاترو زێتر دەرئەکەی ئەگەر بوێرم بەو (علما)یانە ئەڵێم: (تلمیذ)و شاگردی خوان ئەوانەی (علما)ی (هەیئەت)نین (رجماً بالغیب)قسان ئەکەن. ئەگەر بێینە سەر (کشف)ی (اولیا)یان ئەبێ (حیران)آنیان بۆ بلێین (انوار)ی (کواکب)ی دی زۆر بە (واضح)ی ناگەنە سەر عەردی دووسێ شەوە (میل)ی (مشتری)لە (زحل)بۆ لای (شرق)نومایان بوە (خیر)ئەبێ (انشاء الله)﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ وەکی (شجر)ئێوەی لە عاردی رواندیە (انشاء)ی کردنیە لە (جمال الدینی افغانی)(نقل)ئەکەن: (حیوان)دارێ (متحرک)ە (شجر)(حیوان)ی (ثابت)ە... الخ (حیوان)دەماری شین بوون و (زێدە)کردنی لە ناو خۆیدایە؛ (نباتات)و (اشجار) ڕەگیان بە ناو عەردی دادەچێتە خوار ﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا﴾ ئەمرن ئەچنە (قەبر)ێ ئەبنەوە خۆڵ؛ (ذاتاً)ئەوانەی خنکان نەچوونە ناو (قَبر)ی هەرچی بوو لە (أرض)آ گوم بوون ﴿وَيُخْرِجُكُمْ﴾ لە (أرض)ی (لدی البعث)﴿إِخْرَاجًا﴾ خۆی ئەزانی چۆنی ئەکا؛ (مُحقّق)ئەبێ ئەگەر من تێی نەگەم نەتوانم (تصور)ی بکەم خوا خۆی ئەتوانی (تصویر)ی کا (وان علیه النشاة الأخری)(کافیه)﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا﴾ ڕایەخ بە سەریان ئەڕۆن ئەتوانن بە (کیف)ی خۆتان (تَصرُّف)ی تیا بکەن ئەز(جمله): ﴿لِّتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا﴾ (طُرقُ)﴿فجاجاً﴾ (واسع)چ (بین الجبال)چ (في الجبال)چ (في السهول) ڕێی (واسع)و خۆش لە هەموو وڵات لە ناو شارو لە چۆڵی پەیا کرایە (الآ)لە (کۆیە) نەبێ، تادێ (مع الأسف)(طرق)ی ناهەموار تەنگ و ناخۆشتر ئەبێ ﴿قَالَ:

نُوحٌ﴾ باز (عرض)ی (کبریائی)کرد ﴿رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي﴾ (شبه)نەما لەسەر سەر پێچیان (دائم)ن نایەنە ڕایە ﴿وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا﴾ وەکی (امّەت)ی ئێمە بە قسەی (ناصح)آن ناکەن ئەوی (امین)بێ لەگەڵیان ڕێی ڕاستیان نیشاندا بە (عَدوّ)ی دەزانن دوای (رؤسا)یە (جاهل)ەکانی بە (ماڵ)و (ولد)ئەکەون ئەوانەی بە (ماڵ)و منالی خۆیان (مغرور)ن (قوەت)و (ثروەت)یان (فائدە)ی نەدانێ هەر (خسارەت)مەندی بۆ (زیاد)کردن ئەوە لە (زمان)ی (حضرەتی نوحی)وادامەزرایە ﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا﴾ فێڵی زۆر زۆر گەورە گەورە؛ (مکر)ێ کەچیایان هەڵ کەنێ؛ (لاشک)(حفظ)ی ئەو (رُسل)آنە لەو (اقوام)ە (جاهل)آنە، (محظ)بە (حمایەت)ی (کبریائی)بوە (دعایە)ی ئەو (نوع)آنە لە (علیە)ی (رجال)ی (إصلاح)(حقیقةً)(کید)ێ (عظیم)ە. (عَجایب)(نفرەت)ئەهاوێنە دڵان، نەدیتی، نە ناسی، خەڵکی ئەکەنە دوشمنی بابە کوشتەی ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ﴾ دەستیان لێ هەڵ مەگرن، (دوام)کەن لەسەر (طاعەت)و (عبادەت)یان، بە (عمومی)﴿وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ (تصویر)و (نحت)و (هیکل)تراشی دیارە لە ناو (بشر)(قدیم)ە، (هیکل)تراشان باوەڕ ناکەم (احتیاجی)یان بە (شیطان)بێ، (حتی)لە (زەمان)ی (بساطەت)یان کە لە (مغار)آن (انواع)ی (صورەت)یان ئەکێشا وا بزانم ناوی (شیطان)لە ناویاندا نەبوە ئەمڕۆ لە (بغدا)یە (هیکل)ی (مۆد)(عادةً)ئەپەرسترێ لە (طرف)(انگلیز)آن سبەینە و ئێوارە (کتلە)یە (عسکر)بەرابەری (رسم)ی (تعظیم)بە جێئێنن، (حالاً)وا(دوام)ئەکا، بوتپەرستی لە ناو (مسلّمان)آن (انتشار)ئەکات (شێخ علاءالدین)چەند (قطعە)یە (فوتوغراف)ی خۆی ناردبوە لای (ناودەشت)و (ئاکۆ)یەتی (مرید)ەکانی بەرابەری (صورەت)ی (رکوع)یان بۆ ئەبرد، پەرستی (قبر)ی (اولیا)یان لای (سواد)ی (أعظم)بوویتە (رکن)ی (دین)یەکێ لە (اهالی)(کۆیە)چووبوە (زیارەت)ی (امام موسی)خۆی ئەیگێڕاوە

ئـەیووت: "یـازده (سـجده)یـان پێبردمـە بـەر (قبـر)ی (ده)رو پیـەیان لێستاندم" ووتم: "باشه (سجده)کت قانزاجه! هەمووی بۆ پارەیە، خۆیـان و خـەڵکـی (کـافر)ئەکـەن (وَدّ)و (سُواع)و (یغـوث)و (نَسـر)(بـنـا)لـە (روایـەت)ی (ابـن عبـاس)(اصـنام)ی (قـوم)ی (نـوح)ی بـووین؛ کەوتینـە دەسـت عـەرەبان. (امّا)ئـەوە دووره لـە پـاش (طوفـان)و ئـەو (مُدّه)ی (مَدیـده)ئەوانـە چـۆن دیترانـەوە؟ کـوو ناسـران؟ (قیـاس)ی عـەرەبان لـە (بَحاث)ەكانی (ئاوروپایی)له (قرن)ی (علم)و (ترقی)(بشری)ناكرێ ﴿وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا﴾ (رؤسا)یان بە درۆ و دەلەسەو (حیلـە)گـەلێ کەسیان گـومڕاه کردینه ﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ﴾ (عریق)ی (فيالظّلم)﴿إِلَّا ضَلَالًا﴾ (دُعا)یە کـە لـە (سُنّـەت)ی (الهـی)ئـەزانرێ ئەوانـەی (ظـالم)و (عَنـود)و (مُسـتکبر)ن لـە (ضلال)دا (زیاد)ی ئەکەن (نما)یان ئەبێ، بۆ (إضلال) (اختراعات)ئەکەن؛ ئـەو (دُعـا)یـە (دعـا)یـە بـە (حـقّ)ە، ئەگـەرچی تیابـا، (جنـاب)ی (حـق) (وعظ)ی ئەدا ﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ﴾ (خطیئات) (حقیقـةً) (جالـب)ی (عـذاب)ە له (دنیا)و (آخرەت)(اما لازم)ە بزانین چ (نوع)ێ (موجب)ە؟ (یـوم)ێ لـە (ایام)ی (سالفه)له مزگـەوتی گـەورەیی (كۆیـە)بـۆ نـوێژی جـەژنی کـۆ بـوو بووینەوە، بە (تهلیل)و (تکبیر)و (تسـبیح)و (قـرآن)(مشـغول)بـووین، ناگـاه (طیارە)ی (انكلیزی)بە (دەور)ی سەرمانا، دەستی کرد بـە خولانـەوەو گـڕە گڕ، ئەگەر (قُنبله)کی پێدادابایـن؛ هەموو پارچە پارچە ئەبووین ئـەوە لەبـەر چ (نـوع)ە گوناهێکـە؟ (خطـا)ی کێیـە؟ (اخـتلاف)کـە مایـەی (إنقـراض)ە ئـەیکەنـە (ڕەحمـەت)، ئـەوە گونـاه نیـە، (کـل)ی (رئـیس)ێ بـە (الـه)ێ ئەزانرێ؟! چی بڵێم؟ بە (سبب)گوناهانیـان گونـاهی پـێش (دُعـا)ی (نـوح)و پـاش (دعـا)ی بـۆ (خـاطر)ی (مُستغرق)بـن، لـە (اسـتحقاق)ی (عـذاب)، (عـذاب)ی (دنیـا)و (قیامـەت)؛ وە (الا)(حاجـەت)بـە (دعـا)ی (حضـرەتـی نـوح)نـەبوو، بـە گونـاهی خۆیـان (مسـتحق)بـوون بـۆ (عـذاب)﴿أُغْرِقُوا﴾ خنکاندران بە ئاوی (طوفان)ی ئێمە (نظـر)بـە (شـریعەت)ی (طبیعـەت)زۆر

گوناهکارین گوناهکاری (باری)ن؛ (واقعاً)ئەوانی پێشی دایان مەزراند، (أمّا) ئێمە تووشی (جزا)بووین؛ نازانم بلێم چی؟ دڵم زۆر سەخلەتە چارەش ناکرێ! (طوفان)(امر)ێکە (مُحقّق) (طبیعیون)ەکانیش (اعتراف)ی پێئەکەن (فرق)مان بە(تعلیل)ە؛ (غرق) بوون و چوونە ناو ئاگریان لە دوای یەکە ﴿فَأُدْخِلُوا نَارًا﴾ ئەگەر لە (آخرەت)یش بێ، هەر باشە (کانّە)(اعتداد)بەو (بین)ە نیە (نوعاً ما)(ایجاز)ی (زەمانی)یە ﴿فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَنصَارًا﴾ قورتاریان کەن؛ (آلە)ی (جامدە)کوو بە هانایان دێن؟ نە ک ئەوانە لە ڕۆژێ لێ قەومانێ، کەس کەسی کەس نیە؛ (أخصّ)ی (اتباع)و دۆست ڕووت لێوەر ئەگێڕێ، لە کوردی ئەڵێ: "هەتا گوندۆر گوندۆر بوو (قوم)و قیلەمان زۆر بوو هەر کە گوندۆر بە سەر چوو (قوم)وقیلەش لەگەلێ چوو!" پیاوێ (صاحب بُستان)ی گوندۆرە وای فەرمووە: "هەتا گوندۆرەی بووە، گەلێ دۆست و (احباب)چووینە (زیارەت)ی کە گوندۆرە بە سەر چووە ئەوانیش (ترک)ی (زیارەت)یان کردیە" (تمام)ئەو دوو (آیەت)ە کە وتوونە مەیانی (دعا)ی (حضرەتی نوح) لەبەر (اهتمام)(تقدیم)کران ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ﴾ وڵاتی خۆیان نەک هەموو (کرە)ی (أرض)؛ (دخل)ی بە سەر (قوم)ێ دی نیە ﴿دَيَّارًا﴾ پاداریێ؛ (فرد)ێ ئافەریدەیان لێمەیلە ﴿إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ﴾ ئەوانەی (ایمان)یان هێنایە وەریان ئەگێڕن یا (اولاد)یان یا (نشر)ئەبن، (اقوام)ی دیش ئەکەنە بتپەرست (توجیه)ی (حضرەتی نوح) پێی (قیل)و (قال)نایەڵێ کوو وادەبێ؟ ئەو (دعا)یەی کوو ئەکا؟ (عجایب)ە (امثال)ی (خدری)ئەزانن: ئەوە (کافر)ە ئەوە (مسلّمان)ە، لە (زمان)ی (قبل البلوغ)لە پاش ئەو هەموو کەشما کەشم و (طول)ی (دەعوەت)(نوح)نازانێ؟ (کفر)وا تێکەڵاوی خوون و مێشکیان بوە (قابل)نیە (ایمان)نە لە خۆیان، نە لە (اولاد)یان؛ بۆیە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا

يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ دیارە خوا (رعایەت)ی فەرمووە، بۆیە لە (آیەت)ێ دی، خوا ئەفەرموێ: (إِنَّهُ كنْ يُؤمِنَ مِنْ قَوْمِكَ إلاّ مَنْ قَدْ آمَنَ)(معلوم)ە لە (طرف)خوا، (خبر)ی دراوەتێ؛ ئیتر جێی (هذیان)لە (حق)(حضرەتی نوح)نیە، (مُحقّق)گومانی ببردبا یەکێ لە (نسل)ی وان، (اهل)ی (صلاح)و (ایمان)پەیا ئەبێ ئەو (دعا)یەی نەدەفەرموو (هَلْ تَلِدُ الحَيَّةُ إلاّ الحَيَّةَ؟)(عاقبەتی)گورگزادە گورگ شەوەد گەرچی با آدەمی بزرگ شەوەد) (وراثەت)ی (معنوی)(انکار) ناکرێ؛ (شواذ)(قاعدە)هەڵناوەشێنێ، (الهی) خۆت (احوال)و (اسرار)ی (عالم)ی ئێستا ئەزانی (قسم)ی (أعظم)لە (قوم)ی (نوح)(خراپ)ترن قەشمەری بە (رُسُل)و (کُتب)و (قدرەت)ی تۆو ئەکەن، (رَبِّ رَبِّ رَبِّ لا تذَرْهُمْ آمین)﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ﴾ دیارە (مؤمن)بووین ئەوەی بلێ: (مراد)(آدەم)و (حوا)یە قسەیە دوور دەڵێ؛ وا بزانم لە (تورات)ناوی داکی ناڵێ؛ (سید)ئەفەرموێ: ناوی (شمخی)وەکی (سکری)بوە؟ ﴿وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ﴾ (تبادر)دیارە بۆ چی ئەچێ (سفینە)پێی ناڵێن: (بیت)(وکذا مسجد)(خاصةً)بە (إضافە)بۆ (شخص)(بیت)ی (معنوی)(یعنی شریعەت)(فهم)ناکرێ، ئەوەی بێتە (بیت)ی من ﴿مُؤْمِنًا﴾ بە (ایمان)ەوە چ بەئامەدوشود، چ بە (اقامە)(صادق)ە ﴿وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ لە هەموو (کائنات) (الی القیامة)؛ ئێمەش لە پاداشی ئەم (دعا)یە ئەڵێین: صلی الله و سلم علیک یا نجی الله الی ابدا الآباد ودهر الداهرین؛ وە (ایمان)مان بە تۆو بە (واسطە)ی (ایمان)بە (خاتم الرسل)ە (صلی الله علیه وسائر اخوانه من الأنبیاء والمرسلین)﴿وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا﴾ (هلاک)و شکست؛ (الهی)زۆر هەن لە کۆڵیان کەیەوە، چاترە؛ (تاخیر)یان (فائدە)ی نیە؛ (إصلاح)نابن (عالم)بە (فساد)ئەدەن؛ (ایمان)ێ وایان بە ڕۆژی (جزا)نیە. ئەمڕۆ ئەوەی مایەی (تفرقە)بێ لە (بین)ی (مسڵمان)آن (ابقا)ی (ادامە)ی (ظلم)ی بێ ئەندازە و

(تجاوز)لە (حدود)ی (طبیعەت)ە؛ دەستو پا بەستنی (مسلمان)آن بە (سلب)ی (قدرەت)و (اختیار)بە (قید)ی (سنەت)و (بدعەت)(مُوجب)ی (هلاک)و (قطع)ی (امەت)ە لە (بین)ی (مسلمان)آن -(مع الأسف)- (علائم)ی (وفاق)نیە، تا دێ (خلاف)زۆرتر ئەبێ، بزانین چیمان بە سەردێ؟ خوا (حافظ)بێ (الهی)(ارنی ثاري من عدوی وعدوک آمین)لە من و (آبا)و (اجداد)و (امهات)و (جدات)لەوەی بێتە ماڵی ئێمە وە (مؤمن)بێ چ نێر چ مێ بە (زیارەت)یا بە (اقامە)لە (مؤمن)و (مؤمنات)ی (انس)و (جن)خۆش بێ لە (آخرەت)و (قیامەت)ئەوەی (عذاب)ی ئەدەی کەمی (عذاب)دە (دفع)ی (کفار)(تادیب)ی (فجار).[1]

(نوبەت)ی (تفسیر)ی (سورە)یی (الجنّ)ە (مکی)یە وەکی (سیّد)ئەفەرموێ: بالإتفاق و (عدد)ی (آیات)ی (٢٨)ە (بلا خلاف)(إتصال)ی وە (مناسبە)ی لە گەڵ (سورە)یی (نوح)لە مەیانی (تفسیر)ی (آیات)بۆتان دەرئەخەم؛لام وابوو لە (فکر)ی خۆمە دوایە دیم (نقل)ێ لە (ابوحیّان)دەرکە وت لەو (جهەت)ە (سبق)ی لە ئێمە فەرمووە (رەحمەتی لێبێ).

بسم الله الرحمن الرحیم

خوم ئەپارێزم لە (شرّ)ی (شیاطین)ی (انس)و (جن)﴿قُل﴾ (یامحمد)(ﷺ)﴿أُوحِيَ إِلَيَّ﴾ لە (طرف)(جناب)ی (حق)بۆ من (القی)کراوە (بِنامجهول)ی (باب)ی (افعال)ە (بعض)ێ (قرآت)(نقل)ئەکەن نازانم (فائدە)یان چیە؟ (ابراز)ی (سعەت)ی (علم)و خۆماندی کردن بە (توجیهات)ە ﴿أَنَّهُ﴾ (شان)ئەڵێن: (نائب)ی (فاعل)ە ﴿اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ﴾ هەشت نۆیە جموولەیە لە لەمەچێتران نازانم بۆ کوردی وای پێئەڵێ؟ گوێیان ڕاگرتبوو لە (قرآن)گوێیە بە (وعی)و تێگەیشتن وەکی ئێوە و

---

[1] ـــ (سورە)یی (نوح)تەواو بوو پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پینجشەموو حەفتی (شباx)(حمرە)ی (اولی)(٢٣)ی (محرم)سنەی (١٣٦٠)ھ (١٩٤١)م .

(قوم)ی (نوح)نەبوونگوێی خویان بئاخنن تا نەی بیەن خۆیان بشارنەوە (تفرت)بکەن هەڵێن: (مثال)ی ئێوە (حقاً)جێی (طعن)ە لە ئێوە ئەوانە (جنس)ێ دین، چ (مناسبە)یە وایان نیە لەگەڵ (رسول)ی (بشری) ئەوانە بەو(نوع)ە ئێوەش بەو تەرزە جای (تعجب)ە. وا دەرئەکەوی ئەو (عقل)و (معلومات)ی لای ئەو جنۆکانە بوە لای (اشراف)ی (طبقات)ی (عالیە)ی ئەو (بشر)آنە نەبوە قسەیان لە (نفر)کردیە، شتێ (لۆغەوی)یە (علم)ێ (زیاد)بە (تفسیر)نادا؛ (تعریق)ی (جِن)ئەکەن بە (اجرام)ی یا (حیوانی): (هەوائی)(نار)ی ئەتوانن خۆیان (مُتَشکِّل)کەن بە (اشکال)ی (مختلفە)(تشکل)و (تطور)بە (اشکال)ی (مختلفە)لە (طبیعەت)داهەیە (لکن)(اختیاری)نیە؛ (أمّا)لای (ملّیون)آن ئاسانە نە تەنها (جن)و (ملک) (انسان)یش ئەتوانێ ئەو (صَرف)و (تحویل)ە بە خۆی بکا بە (شرط)ێ (ولی) خوای بێ وەکی (قضیب‌البان)ی (موصلی)باشە، وابێ ئەدی بۆ چی (عُلما)ی (اعتقاد)(قسم)ێ (عظیم)ئەم (تعریف)ە (قبول) ئەکەن (أمّا)(قبول) ناکەن (انسان)بە (قدرەت)و (اختیار)ی خۆی (افعال)ی خۆی بکا؟ (مع‌أنّە)لە (طرف)خوا بە (بعض)ە (افعال)(مکلف)ە ئەگەر ئەلێن: (باذن اللە)یە با بو ئێمەش وەکی غزالی ئەفەرموی: (باذن اللە)بێ (مع أنّە) نازانم (معنا)ی (باذن اللە)ی چیە؟ ئەفەرموون: (انکار)ی (اجن)آن (کفر)ە بەڵێ ئێمە لەبەر (قرآن)(ایمان)بە (اجن)ە ئێنین؛ لە (قرآن) دەرئەکەوێ (نوع)ێ هەیە بە (حیات)و (ادراک)بزر لە ئێمە (مکلف)ن وەکی (بشر)؛ (مؤمن)و (کافر)یان هە یە (أمّا)بەو (قدرەت)و (قوەّت)و (عَلاّم الغیوبی)بە (ایمان)مان پێی نیە لە (حدیث)ئەفەرموێ: (اشکال)ی (مختلفە)ن خەیلێ خووب (شێخ)ی (ابن سینا)(تعریف)ی (جن)ئەکا ئەفەرموێ: ئەوە (تعریف)ی (شرح)ی ناو (یعنی)(حَدّ)ی (حقیقی)نیە لەبەر ئەوە ئەلێن: (انکار)ی (وجود)یان ئەکا نا (انکار)ی تیانیە. (جناب)ی (سعدالدین)ئەفەرموێ: (تعریف)ی (علوم)آن وەکی (کلام)و

(تفسـیر)و (سـائر)لـه (أوّل)ە وە (تعریـف)یّ لفظـیـیـە (بعـد التحصـیل والتحقیق والتدقیق)ئەبێتە (حَدْ)...الخ ئەو سێ یەی لا هـەن بۆ ئـەو تعریفـە (حَدّ)ە ئەوەی لا نەبێ (لفظی)یە (شێخ مؤمن)یّ باشە لە (سـمعیات)وەکـی ئێمە (قبول)ی (قول)ی (خاتم الرسل)ی کردیە؛ (حقیقة ایمان)بە جنۆکەی بـەو (درجـە)کـە لای کـولێ نانیـان هەیـە لەگـەلێ (جهـەت)(بشـر)ی بـە (فساد)بردیە! ئەگەر گوێ لە (ملیون)آن کەین ئەبێ بلّێین: خواش (تشکل)و (تمثـل)ئـەکا (العیـاذ باللـە)وەکـی (جبریـل)وەکـی (ابلـیس)لـە (مُجَّردات)و (روحانیات)آنە (جمـع)یّ لـە (اولـی)یـان ئەفـەرموون: خـوا (مثـال)ی هەیـە (آیـەت)ی (و لـە المثـل الأعلـی)بـەو جـۆرە (تفسـیر)ئەکـەن. (صـریح)ی (کلام)(شـاهده)(جنـاب)ی (رسـالەت پـەناە)لـەو (وقفـە)دا نـەیدیبوون بـە (وحی)زاناندیتی (عبارەت)ی (بیضاوی)گەلێ کەس لێی بـە (غلـط)چـووین وە (بخاری)لە (ابن عباس)(نقل)ئەکا کە (جناب)ی (رسول)نەیدیون (امـامی رازی)وە (سیدی آلووسـی)لەگـەلّ ئەوانـەی (انکـار)ی (جـن)ئەکـەن (طـول)و (تفصیل)و (سؤال)و (جواب)یـان هەیـە لام (نقـل)ی (مـلال)ئـەدا لـە دوای چەند (آیة)یّ (بحث)ی (سبب)ی هاتنیان و (سماع)یـان ئـەکرێ ﴿فَقَـالُوا﴾ لـە گـەڕانـەوە بـە (قـوم)ی خۆیـان ووت: ﴿إِنَّـا سَـمِعْنَا قُرْآنًـا﴾ (کـلام)یّ (مقـرو)﴿عَجَبًـا﴾ (بـدیع)(مُحیـر)﴿یَهْـدِی إِلَـی الرُّشْـدِ﴾ (قـاموس)ئـەلّـێ: (الاستقامة علی طریق الحق مـع تصـلب فیـە)ئـەو (قـرآن)ە (هـادی)یـە بـۆ (حق)و (صواب)(اهم)و (أعظم)ی (ایمان)بە (وحدانیـەت)ی خوایـە ﴿فَآمَنَّـا بِـهِ﴾ بـە (قـرآن)کـە (کـلام)ی خوایـە وەکـی ئێـوە نـەیان ووت: (سـحر)ە، (کلام)ی (مجنون)ە، (أساطیر)ە، دە ک هەناوتان کەوی، بە جنۆکان نـابن؛ لە (فهم)و (ادراک)﴿وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ ئێوەش ئەلّـێن (لا تـدرن آلهـتکم أنصروا آلهتکم)وەکی منداڵ ئەگەر بووکۆ کـەیان لێتێـک دەن بـە گـژ بـاب و داکیان دادەچن. هەرچی بێ بە هەر تـەرزێ (خیـال)ی کـەی کـەس ناکەینـە (شریک)ی خوا نە لە (ذات)نە لە (صفات)(تقدیس)ی ئەکـەین لـە (مُثُـل)و

(مثال)﴿وَأَنَّهُ﴾ به (فَتح)لای (جمع)یّ به (کسر)لای هەندیّ ﴿تَعَالَى﴾ بلّنده ﴿جَدُّ رَبِّنَا﴾ (عظمەت)و (کبریائی)(الهی)له (شریک)له (مُشابه)ی (طبیعیات)(معنا)باپیر، (حاشا)(بعد الإیمان)به (وَحدانیەت)ی (الهی)و (قَول)به باپیر حاشا (أنّه)بەختی خوای لەوەی بەرزتره (شریک)ی هەبیّ (مولود)بیّ یا (والد)﴿مَا اتَّخَذَ﴾ (بالذات ممنوع)ه ﴿صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾ (غنی) (لذاته) (غَني عَنِ الشَّيْءْ)(مُقدس)ه له (احوالات)ی (طبیعەت)ی (حیوانیه)؛ ئەی (قوم)ی (نجیب)ئەی (اهل)ی (شرک)و (تثلیث)گویّ له قسەی؛ وه (کلام)ی (فیلسوف)آنی (أجِنّ)آن کەن (شریک)ی بۆ خوای پەیا ئەکەن به (وهم)ی خۆتان ئەڵێن: خوا ژنی هەیه وه کوڕی هەیه و (ولد)ی بۆ خوای پەیا ئەکەن نا (شکری)نەبیّ چی به خوای ناچی لەبەر جوان هەڵدیّ لەویّ و لەویّ خۆی ئەشارێتەوه ئایا نازانن (قاعده)ی (توالد)له (فَرع)ی مردنه؟

بێینه باسی بەخت و (طالِع)هەیه؟نیه؟ (واقعاً)له (حدیث)ئەفەرمویّ: لا يَنْفَعُ ذا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ (آمنّا)له (طرف)خوایه (أمّا)وادێته (خیالّ)شتیّ هەیه (لکن)به (تحولات)ه که سیّ ئەمڕۆ (شانس)ی هەیه هه موو کاری باش بۆ دیّ سبەی ئەگۆڕیّ؛ وا ئەبیّ (شخص)یّ له بەد بەختی و ناخۆشی ئەژیه ناگاه دەرکەی لیّدەکرێتەوه (حالّەت)یّ دی دی (أمّا سرّ)ی (مجهول)ه؛ بنۆڕه (أساطیر)ی (مصری)و (یۆنانی)یان (عجایب)ه له (اوهام)و (خیال)یان نەبوو (حقاً)(رسول)آن (حق)یان لەسەر ئێمه (عموم)ی (بشر)زۆره ئەوان نەبان، ئێمەش ئەو (انسان)ه شۆگاییه نه دەبووین. وه (حُکما)ی (الهیون) لەسەر (عُلما)یان (حق)یان زۆره ﴿وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا﴾ تا (حالّ)، (رؤسا)یان بوون؛ که له (حق)گەیشتن پێیان ئەڵێن: "(سُفهاء)" هەزار ئافەرین لەو (اجنّ)آنه؛ بەوانه بڵێین: "لەمه چێتر" زۆر به جێیه. (سواد)ی (أعظم)له (امت)، گەلیّ (أغلاط)یان بۆ (عیان)بوه؛ ئەزانن (رؤسا)یەکانیان (سفیه)ن، (مع هذا)(دائم)ن لەسەر (تعظیم)و

(تقدیس)یان، وە لە (حق)خوا، وەک سەگ ئەوەڕن؛ (ویقولون): ﴿علی اللهِ شَطَطا﴾ ئەوانی مەڕ، لە (شطحات)یش دەرچووین؛ قەسە ی درۆ و (مُتجاوز)لە (حد)، لە (حق)خوا ئەڵێن؛ خودا لە ڕیزی (متطورات) (حساب) ئەکەن، کەم و زۆر هیچ (فرق)ی نیە؛ یا (قسم)ێ لە (ممکنات)؛ بەستەزمان ڕاناوەستێ؛ (انسان)(حیران)و انسان (أمّا)لە (حد)ی خۆی (تجاوز) ئەکا، یا بە رە ژێردێ، یا زۆر بەرە ژوور ئەڕوا؛ (خصوصاً) (ابناء الله)، (أحباء الله)وە (أولیاءُ الله)—(في الواقع)- (أقوال)ی دوور و نا (معقول)یان هەیە ﴿وَأنَّا﴾ (قبل الإیمان)﴿ظَنَنَّا﴾ (ظن)ێ (قوی) (اعتقاد)ێ (جازم)﴿أن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ﴾ (ملک)قسەی لێناکرێ ﴿عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ ئەوە (کید)ێ (عظیم)ە لە (طرف)(مُضل)آن (مساکین)آن هەڵ ئەخەڵەتێنن ئەوانە درۆ ناکەن هەرچی بیڵێن ڕاستە درۆ بە (کُفر) ئەزانن کە ئەو (اعتقاد)ە (رسوخ)ی بەست؛ ئەوجا ئەوەی هەوەسیان لێ بێ ئەی خەنە گوێی (مساکین)ەکان (عقل)و هۆشیان لە دەست چووە. (فرقە)یە لە(مسلمان)آن وا هەڵخەڵەتاین بۆیە (رئیس)ەکەیان کە گوتی: "من خوام" بێ(توقف)(تصدیق)یان کرد درۆ (کفر)ە خۆ (صاحب)ی ئێمە (مُنزَّه)ە لە (کفر)کە وابێ ڕاست ئەکا خوایە! ئەی (بَشر) چەند (مهیا)ی بۆ (قبول)ی قسەی پڕو پووچ نازانم بۆ چ وای؟ (أساس) وادامەزرا (وَقاسَمَهُما إِنِّي لَكُما لِمَنْ النَّاصِحِينَ فَدَلاهُما بِغرورٍ) خوای (تعالی)ن (إیقاظ)مان ئەکا، لە (شر)ی (رؤسا)لە(کید)یان ئەمان ترسێنێ (لکن) ئاگادار نابین زوو فریدە ئەبین (شێخ‌رضا)ئەڵێ:

ساغ لە دنیادا نەماوە گەر قسەی ساغت دەوێ

بێ هە زارت پێنیشاندەم گەر قورمساغت دەوێ

(سیاسیون)و (رؤسا)ی (ادیان)(علی الأغلب)لەگەڵ (بشریەت)ناساغن (مع هذا) (مَقبول)و (مطاع)ن، پاک و خاوێن و (مُخلص)و (خالِص)و (ناصِح)و (مشفق)و (امین)یان ناوێ ئەوبێ چارانەش وەکی(بَشر) گومانیان

بردیە کەس لە (جن)و (انس)لە (طرف)و (جهەت)ی (الـه)درۆ ناکا؛ ئـەوەی (رؤسا)یان گوتویانە (قبول)یان کردیە بـە (تقلیـد)وەکـی کـوردی دەڵـێ: بـە گوێی مامۆستا ئەو (اجن)آنە لە (حیلە)یان گەیشـتن.(انسـان)ەکـانی ئێمـە (مع الأسف)وەکی خۆیان مانەوە. خوایە خـۆت ئـەزانی (انـواع)ی درۆ یـە چ (الوان)ێ (تجسّم)ی کردیە بە (دعـا)یـەی درۆ (بشـر)تارومـار کرایـە ﴿وَأَنَّـهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ﴾ لە (انسان)آن ﴿يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ﴾ کە مابانەوە لە جێی چۆل ودوور لە ئاوەدانی؛ لـە خۆیـان ئەترسـان هاواریـان ئـەکرد بـە دەنگـی بڵنـد (ئـەی (عزیـز)ی ئـەو (وادی)یـە خۆمـان ئـەپارێزن بـە تـوو لە (سُفها)ی (تبعە)ی توو هەرزەکارەکانی لە (طاعەت)ی تووردان ﴿فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ (رجـال)ی (انـس)(تکبُّـر)و (عُتُـوّ)و (طغیـان)و گونـاهی (رجـال)ێ (جـنّ)ێ زێتـر ئەکـەن؛ دیـارە (رجـال)ی (انـس)بووینـە (باعـث)ی (زێـد)ە (ضلال)ی (رجال)ی (جن)چ جایە (ضلال)ی خۆیان (مُضلّ)یـش؛ چ جایـە (إضلال)ی (بشر)(إضلال)ی (جنّ)یش ئەکەن؛ ئەو (معنا)یە (مُتبادَر)ە وە لـە (مُجاهـد)و (جماعـەت)ێ (منقـول)ە،(أمّـا بـالعکس)لام خـۆش نیـە؛ (ایمان)ی (انس)ئەمڕۆ بە (جن)(قیاس)لەو (وەقت)ی ناکرێ؛ ئەمڕۆ هەرچی هەن؛ئەوەن لە (قُدرەت)و (عِلم)یان مەپرسـە گـوێ لـە کـوڵ نـابێ یـەکان کـە سـەیرە لـە (عزیمـەت)گرتنـەوەیان دایـە ئەوەنـدەی تیـا هەیـە کـە (شـێخی انـس)(امـر)بـە شـاهی (جـن)ئـەکا؛ ئەمـەش بـە خـۆڕایی نیـە زار بەسـتنیان (عجایب)ە؛ وابزانم ئەوەی لەسـەر (بَشَـر)(مُسلَّط)ئـەبن بـە کـوردی مێملـی پێدەڵێن: ﴿وَأَنَّهُمْ﴾ (انس)﴿ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ﴾ (ایهـا الأجنـە)﴿أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا﴾ بە (رسالەت)، یا (مُنکر)ی (رسالەت)ن، یا وەکـی جـوان دەڵـێن: دوای (موسی)(رسول)ێتر نـابێ" یـاخود لـە (عـرەب)آن نـابێ. وا دیـارە ئـەو (اجن)آنەی لە ولاتی عەرەباندا بووین عەرەبیيان زانیە لە (قرآن) گەیشـتینە؛ خـۆ نـاڵێن: وەک (بابانسـیم)ی (عیّـار)هـەموو زوبـان ئـەزانن بـا (وجـود)ی

ئـەوەی بتـوانێ خـۆی (مُتشـکّل)بکـا بـە (اشـکال)ی (مختلفـە)ئـەتـوانی (ألسِنه)ی (مختلفه)بێ (تعلیم)بزانی. ئەدی کورد، تورک، فـارس؛ کـە مـردن چوونە نـاو (قبـر)ی؛ دەر (حـال)فێـری (عربـی)ئـەبن وە ئـەتوانن بنووسـن؛ بەڵێ ئەی بەر چاو نەبی!؛ بە زوبان ئـەتوانی ئـەوەی خـواهیش کا بـێ‌ڵـێ. یاخود ئەوانە (انکار)ی (بعث)و (نشور)یان کردیە؛ کوو ئێوە (ایمان)تان بە (قیامـەت)نیـە ئـەوانیش وا ﴿وَأَنَّـا لَمَسْـنَا السَّـمَاءَ﴾ (یعنـی)(طلـب)مـان (مُلاحظە)مـان کـرد ﴿فَوَجَـدْنَاهَا مُلِئَـتْ﴾ پـڕ کـراوە ﴿حَرَسًـا﴾ لـە هێشـکی ﴿شَـدِيدًا﴾ بـە (قـوەّت)﴿وَشُـهُبًا﴾ بلێسـە گـاه گـاه (بَعـد قـرونِ المُتطاولَه)ئەستێرە ئەڕژێن (امّا)بە زۆری وا بـزانم، نووسـیمە، لـە (تـاریخ)ی (١٢٠٥)بە (نوع)ێ بوە ئەستێرە باران (مُدهِش)بوو، لـە (شـرق)بـۆ (غـرب)؛ لە (غرب)بۆ (شرق)لە (شمال)بۆ (جنوب)لـە (جنـوب)بـۆ (شـمال)دادەڕژا؛ (أمّا غریب)وە ئەو (نوع)ە مەگەر لە (بُطون)ی (کِتاب)آندا بمێنێ لە (فکر) ئـەڕوا، گـەلێ کـەس ئاگاشـیان لـێ نیـە. وا تێئەگـەم ئـەوە بـوە، (أجـنّ)ە دیتی‌یانە وە ترساین: داخوا چی ئەبي؟! و(الآ)بێ (شُبه)یـە (عـالم)زانیبـووی کە پێش ئەو (وەقت)ی بوە؛ (عُلما)ی (هەئیەت)ـ (قبل‌الرسـالة)ـ قسـەیان لـێ کردیـە ﴿وَأَنَّـا كُنَّـا﴾ (قبـل)ە زیـن ﴿نَقْعُـدُ مِنْهَـا﴾ لـە (سـمَـا)لـە (عُلو)﴿مَقَاعِدَ﴾ (ظاهر)وەیە بە چوونـە سـەر یـەکتری نـەبووبێ؛ دادەنیشـتن ﴿لِلسَّمْعِ﴾ بۆ گوێ لێ بوونی (اخبـار)ی (سـماء)چ (مـانع)ێ نـەبوو؛ (ذاتـا وحـی)و (رسـالەت)لـە (دیـار)ی (عـرەب)ێ نـدا نـەبوو تـا بـۆ (حفـظ)ی (وَحی)ئـەو (حراسـەت)ە بکـرێ ﴿فَمَن يَسْـتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَـهُ شِـهَابًا رَّصَدًا﴾ (وقت)ی (بعثەت)ی (رسول)،گەرچی نەیانزانیە، ئێستا ئەوەی (استماع)بکا (یعنی)بە (وجە)ی (سابق)ی (قصد)ی بکا نازانم (تعبیر)لـە (وجدان)کـوو بدەمەوە؟ (أنَّهُ إنتظاری)یـان ئەکـەن؛ (أمّـا)پـاش (زمـان)ی (رسـالەت)ئـەوە نـامێنێ نـەما نـە ئـەوان کـەڵەکـە ئەکـەن نـە (شُـهب)یـان پێـدا دەدرێ

(قاموس)ئەڵێ: رَصَدَهُ رَصْداً ورَصَداً؛ راقَبَهُ" بۆیە ئەوەی دروستی ئەکەن بۆ (احوال)ی (کواکب)و (افلاک)زانین (رصد)ی پێ ئەڵێن: لێرە دا (مراقبە)ی (حرکات)یان ئەکەن. (شێخی بخاری)لە (ابن‌عباس)(حدیث)ێ (نقل)ئەکا (مُفصّل)ە (حاصل)ی (جَنابی رسالەت)لەگەڵ (بعض)ێ یارانی ئەچن بۆ لای (سوق عکاظ)(أجنّ)آنیش خول ئەدەن؛ بزانن (سبب)ی (ارسال)ی (شُهب)چیە؟ (جمع)ێ کە ڕوویان کردبوە (تهامە)لە (نخلە)ناوی؛ (موضوع)ێیە لە (بین)ی (مکە)و (طائف)؛ تووشی پێغەمبەری ئەبن نوێژی سبەینێی بە (جماعەت)ئەکرد گوێیان لە (قرآن)ڕاگرت، ووتیان: ئەوەیە بوویتە (حائل)لە (بین)ی ئێمەو (خبر)ی (سماء)"لەوێندەرێ گەڕانەوە (خبر)یان دانێ خوای (تعالی)ن قسەی وانی بە (وحی)بۆ پیغەمبەری نارد؛ (ابن عباس)دەفەرموێ:" نەیدیتن" شتەدیش (نقل)ئەکەن (اهل)ی (طائف)کە چاویان بەو (حاڵ)ە ئەکەوێ (عبد)آن ئازاد ئەکەن، (ماڵ صرف)ئەکەن (شخص)ێ ناو (عَبد)یا (لَیل)ناو پێیان ئەڵێ:" ڕاوەستن تێ (فکر)ن، ئەو ئەستێرانەی کە ئەیان ناسن ئەگەر لە جێی خۆمان چ نیە؛ شتێکە لە (طرف)(مُحمد)ی (یعنی)(سحرە)وە (الا)دیارە ئاسمان وێران ئەبێ" (طبیعی)کە ئاسمان وێران بوو (أرض)یش کاول ئەبێ، (رَبّ)ی کاول بێ خوایە. وا چاکە (یالیلی)بە (یالیلی)هەڵ بلێین. ئەو لە (بعض)ێ (ملا)یان (عاقل)تر بوە، (مُخالَفات)و (روایات)ی (مُسند)و (غیرە)(مُسنَدَە)بوە بۆ ئەوە ی بنۆڕە: (شرح)ی (بخاري)(اعني: فتح الباري)، من بە (نظر)ی (قاصر)آنە ئەڵێم: ئەو (ایمان)و (علوم)ی لەو (سورەت)ە (نقل)ی ئەکا، بە ئەوەندە (صُحبەت)ە بە (استماع)ی چەند (آیەت)لە نوێژی سبەینێ بۆ (مؤمن)(جن)نەبێ (ملک)بێ پەیا نابێ وا بزانم زۆریان (إستماع)کردیە؛ بە (تأمل)و (تَدبُّر)و (تَفکُّر)و (ملاحظە)ی (معانی)(آیات)ی (قرآن)یان کردیە؛ ئەوجا (واصل)ی ئەو (مقام)ە بووین؛

وە ئەو گفتو گۆیە ئی جاریَ نەبوە (والعلم عند اللـه)﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِي﴾ ئەو (وەقت)ی (قبـل الإیمـان)﴿أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ﴾ (عُمـوم)(ممكـن)ە (مُراد)یش (هلاک)یا (بلآ)یە (عام)بیَ. ئەوەی (ایمان)ی بە (وحدانیـەت)ی خوای بیَ. ئەزانیَ (مَبْدأُ الكل): خوایە؛ (غایەت)ی بلّیَین: (شـر)(مقصـد)ی (اولی)نیە یاخود لە (عالَم)ی (تشریع)و (تكلیف)(ارادە)ی (شر)ناكا (فـي الحقیقة)(اسباب)ی (شرور)(اكثر)ی (تكوینی)یـە (جهـل)یـش (مداخلـە)ەی زۆرە منـدالّیَ تـازە بـە سـەر پیَئەكـەویَ؛ هـەلّدەسـتی ئەكـەویَ (هكـذا)تـا (ادمان)ئەكا و گورج ئەبیَ (اسباب)ی (ظاهری)(معلوم)ە؛ وا دەبیَ دەكەوی سەری ئەشكیَ ئەكەویَتە ئاگر ئاگایان لیَ نەبیَ؛ (معتزلی)و ئەوانەی ئـەلّـیَن: "(فعـل)ی خـوای لـە (حكمـەت)(خـالی)نیـە" وە گـەلّـیَ یـا (كُـل)ی (شـئ)(رأسـاً)(نسـبەت)بـۆ خـوا ئـەدەن، زۆر مانـدین، بـۆ (تصـحیح)ی (عقیـدە)(رەحمـەت)ئەكیَشـن؛ ئـەمرۆ (بَشـر)لـە (شـر)یَ دایـە (نسـبەت)ی لەگەلّ (خیر)بە (ملیون)ە (بعض)یَ بە (لا یُسألُ)خۆیـان (نجـات)ئـەدەن؛ ئایا (معنا)ی (وَمقتضی)ی (لایسال)وی ئەمەیە؟ (مُشكل)ە هـەرچی هەیـە؛ (دنیا)پڕە لە (شـرور)، (نسبەت)بۆ (امـور)ی (غیـب)ی (غیـر)ی خـوا یـا (دَور)و (دولاب)ی (فَـلَک)(مقارنە)ی (كواكب)لام (كفر)ە (جهالەت)ە.

نازانین (ادارە)ی (شر)كراوە لە (حق بـَشر)﴿أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا؟﴾ (امّا)دوایە (معلوم)یان بـوو؛ زانیـان (قـرآن)(یهـدي الـی الـرُّشـد)ە ئەوانـەی (اهتـدا)ی پـیَ ناكـەن لەبـەر (حَسـد)و (رقابـەت)ە (اسـتكبار)ە خۆیـان لـە (صـاحب)یَ (دەعـوەت)زیَتـر ئـەزانن ﴿أَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ﴾ (امـین)و بـاش (ضرر)بە كەس ناگەین ﴿وَمِنَّا دُونَ ذَالِكَ﴾ لـە (صـلاح)بـە رەزیَـر (فسـاد)ە، (بعض)یَ بە ئاشـووب و شـەڕو (فتنـەمان)هـەن؛ لەگـەلّ خۆیـان یـا لەگـەلّ (بَشر)﴿كُنا﴾ (قبل الإیمان)﴿طَرَائِقَ قِدَدًا﴾ (فِرق)ی (مختلف الإهواء)؛ هەر (فرقە)یـە بـە دوای (هـوا)و هەوەسـی خـۆی كـەوتبوو ﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا﴾ ئیَسـتا

(بعدالإیمان)(ممکن)ە (قبل الإیمان)(ظن)یّ وایان بوویێ نۆر (عریق) نەبووین لە (کفر)و (شرک)، بۆیە بە (استماع)ی (قرآن)زوو (ایمان)یان هێنا ئەگەر هینە (کافر)ەکان بن (رەحمەت)(ایمان)یان ئێنا؛ وامان (ظن)ئەبرد ﴿أَنْ لَن نُّعجِزَ اللّهَ فِی الْأَرْضِ﴾ هەر کویێیە بیێ ﴿وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا﴾ بە هەلاتن قورتار نابین ﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى﴾ (قرآن)﴿آمَنَّا بِهِ﴾ (عکس)ی ئێوە ئەوەندەی (قرآن)نان بە سەرا ئەخوونیتەوە (استکبار)ئەکەن ﴿فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ﴾ بەو (نوع)ە کە (قرآن)و (رسول)ئەیفەرموون، وە بە (آیات)(بیان)ی ئەکەن ﴿فَلَا يَخَافُ بَخْسًا﴾ (نقض)ی (جزا)﴿وَلَا رَهَقًا﴾ لە بەسەرداهاتنی (ذلّەت) ناترسیێ بە سەری دانایە؛ ئەگەر لە (دُنیا)ش (إضطهاد)بکریێ وەکی (مسلّمان)آنی (حاضرە) لەبەر دەستی (اجانب). (تاریخ)ی (اندلس)بخوونەوە (حتی)ئەلّێن: (بعض)یّ لە (سلسلە)ی (کفرە)(أصلاً)ئەچنەوە سەر (سیّد فلان)(بن)ی (سید فلان)(آبا)و (اجداد)لە (سادات)ی (کرام)(اشراف)ی (اسلام)دیارە (ایمان)ی (مؤمن)لەو (نوع)ە (ذلّەت)ە (شرط)ی هەیە لە (آخرەت)(مُؤمن)ی ڕاستی لە (عزّ)یّ (فَوق التَّصوُّر) دادەبیێ (ولله العزة ولرسوله وللمؤمنین)(بعض)ە (معنا)یەتر ئەفەرموون؛ بە کەشما کەشمن ﴿وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ﴾ (بَعد بُلوغ الدَّعوة) ﴿وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ﴾ (جائر) دوور لە ڕیێی (حق)﴿فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا﴾ (قَصد)ی (رُشد)یّ (عظیم)ئەکەن؛ (نفع)ی (دنیا)و (آخرەت)ی تیایە ﴿وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ﴾ (ظالم)ەکانی لاڕیێ ﴿فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا﴾ وەکی (بعض)یّ (ناس)؛ کەوابیێ (وَقُودُها النّاسُ والحِجارَةُ والجِنْ)ئەوانە (مُعذَّب) ئەبن (مُسلم) (مثاب) ئەبن (ممکن)ە بلّێین: (بلوغ)ی (رُشد)و (استقامە)وە (سلوک)ی ڕیێی ڕاست بۆ (اهل)ی دانیشن وەکی (جنّەت)ە بۆ (روح)(لَذّەت)ە ﴿وَأَنْ لَوِ اسْتَقَامُوا﴾ (قسم)یّ ئەفەرموون: (عطف)ە لەسەر (أنّه إستَمَعَ) (آیەت)ێکە (رأساً) بۆ (جناب)ی

(رسول الله)ی هاتوه (ضمیر)ی (مُستَتر)(ضمیر)ی (شأن)ە؛ (توجیە)ی (کلام)ە بۆ (انس)و (جِن) ئەگەر (استقامە)یان بوویا ﴿عَلَى الطَّرِيقَةِ﴾ لەسەر ڕێی ڕاست مابان ﴿لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقًا﴾ ئاوێ زۆر بارانێ بە (خێر)و (برکەت)وە (بعض)ێ ئەفەرموون: (ضمیر)(راجع)ە بۆ (قاسط)ەکان وەکی (قوم)ی (نوح)ی کە پێی ئەفەرموون: (إستَغْفروا رَبّكُم إنَّهُ كانَ غَفاراً يُرسلِ السّماءَ عَليكُم مَدْراراً)(أمّا)(نوع)ە (تاویل)ێ بۆ (ماء)ئەکەن ئەڵێن: (رزق)مان بۆ (واسع)ئەکردن ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ بۆ (امتحان)وەکی (بشری)ئەوەی (طینەت)ی باش بێ (مغرور)نابێ وە (الآ)ئەڕوا ئەستوور ئەبێ ئەشکێ ﴿وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِ﴾ (بعد الإختیار)وەکی (قارون)ی (إنما اوُتيتُهُ على علم)لە خوایەوەی نازانی ﴿يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا﴾ ئەیهاوێتە (عذاب)ێ؛ بڵندی ئەکاوە سەر بەرەژێر ئەخا؛ وەکی گۆشتی ناو مەنجەڵ قوڵپان بدا وە (ممکن)ە بڵێین (جِن)یش لە باران بارین (استفادە)ئەکەن ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ﴾ ئەی (انس)و (جِن)با ئەوانیش مزگەوتیان ببێ؛ (مساجد)(عموم)ی بۆ خوایە (خاصةً مسجدُ الحرام) ﴿فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾ (معأنە)ئێوە کردووتان بە (بیتُ الأصنام)، گوێ لە (خطبە)ی (ئاستانە)(أعظمیە)؛ (کرخی)وە (شێخ عمر)ی وەبرۆ بۆ (موصل)لە (جامع)ی (نبي جرجیس)وە (نبي شیث)وە (نبي یونس)؛ (بعض)ێ (جوامع)ی تر کە (مرقد)یان هەبێ ڕاگرە چ ئەخوێنن؟ چ ئەڵێن؟ چ بڵێین؟ لە (حق)ئەوانەی (مُقابل)ی (مساجد)بە (أسماء)ی (مُختلفە)(مواضع)دروست ئەکەن چ دەڵێی؟ لەوانەی ناوی خودا و (رسول)ئەبیەن کرکە ناکەن کە ناوی (شێخ)یان بیست؛ های و هووی و (نَعرە)و گرمە و لرمە و لرفە ئەکەن؛ (بدن)یان ئەکە وێتە (زلزلە)! خۆزی سەد خۆزی لە حیاتی ئەوانە چەند معلمان هەبا (حوائج)ی (حیات)ی (عمومی) لی درست کرابا؛ و(رصد)خانەکانمان تیک نەچوبان!

هەندیان مزگەوتی گەورە دروست کرد ئێستا نازانن چیان لێ بکەن؟ لە جیاتی بعضی مزگەوت لەو جێی (رسول)ی (مجتبی)نوێژی لێکردبوو (أجنّ)آن (استماع)یان کردبوو و (علامەت)ێ (امتیاز)یان دانابا باشتر بوو (مع الأسف)(وهاب)ی لەگەڵ (معالم)ی (تاریخی) رێک ناکەون، ئەوەش (تفریط)و (جهل)ە بە جملە بە (تاریخ) و (حیات)ی (دینی)؛ (نظر) بە (ادّعا)ی (ادیان)ە کانی دی چەندشتی بە (قیمەت)بوون، (شێخی ابن الجوزي)لە (صید الخاطر)ی خۆی (بعض)ە قسە ئەفەرموێ؛ (دائر)بە (بنا)ی (مسجد)و (تکیە)و (زاویە)، (حالاً) (کتیب)ەکە لەبەر دەست نیە؛ فەرمایشەکانی بنووسم وە چاکیشم لە (خاطر)دا نەماوە.

(نهي)لە (عبارەت)ی (غیر)ی خوای با (عام)بێ لە (انس)و لە (جن)بە خواتان سویند ئەدەم؛ (أعضا)ی (سجدە)لە (مساجد)دێتە (فهم)؟ (ولَو)لە (دنیا)هیچ (مسجد)نەبێ؛ نازانم چی بکەم؟ لە چەنگ (روایات)ی (مختلفە)ی (غیرە)(مفهوم)! ﴿وَأَنَّهُ﴾ بە (فتح)﴿لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ﴾ (رسول)ی (اکرم)﴿يَدْعُوهُ﴾ (قیام)نوێژ نایەتە (فهم)وا بزانم ئەوانە (جمع)ێ لە (جن)ن لە (اول)ی (دەعوەت)(حاضر)بووین (دەور)ەیان داوە، بۆ (استماع)وە (ملازم)بووین (ظاهر)وەیە (قیام)بە (دەعوەت)ی (رسالەت)ە وە (ضمیر)بۆ (جنّ)(أمّا عود)(ضمیر)بۆ (کفار)ی (قریش)وە (معنا)ی ﴿كَادُوا﴾ ئەو (اعدی)یانە ﴿يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ (تَلبُّد)و (تَراکم)و (توافُق)یانە لەسەر (عداوەت)ی (رسول اللە)(لیطفئوا نور الله)(نظر)بە (آیەت)ی دوایە (ابنُ جریر)و (ابنُ کثیر)(اختیار)یان کردیە؛ (أمّا)ئەوە (حاجەت)بە (نسبەت)(وحی)ناکا؛ (امر)ێ (ظاهرە) وەکی ئی (جن)نیە، (لکن)دیارە زۆر کەس (نوعاً ما)(تلاعب)ئەکەن بە (قرآن) بنۆڕێ (بعض)ێ ئەڵێن: (مُراد)(عبدالله بن سلام)ە، (عبدالله بن سلام) لە کێ؟ وە (مکّە)لە کێ؟ لە (اوائل)ی (رسالەت)(عبدالله بن سلام) ناوی نەبو.

ئەمەش (طعن)ە لە (بشر)(جن)بەو (نوع)ە (دەور)ەیان لە (رسول الله)ئەدا ئێوەش بە چ (نوع)ێ (دەور)ەی ئەدەن؟ (عن اليمين والشمال عزين) ﴿قُلْ: إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا﴾ ئەوانیش ووتیان: آمنا بالله وبوحدانيته یا (عبادەت)و (دەعوەت)ی خوای بێ (شریک) (مُوجِب)ی (اجتماع)ی ئێوە نیە لەسەر (عداوەت)من یا هەرچی بادا باد، من دەست لە (دەعوەت)هەڵناگرم)﴿قُلْ: إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ﴾ (ايها المؤمنين من الجن)یا خود (ايّها الإنسان)﴿ضَرًّا وَلَا رَشَدًا﴾ لەبەر (مقابلە)ئەڵێن: (مُراد)لە (ضَر)(غَئی)یە (بعض)ێ بە (جوان)یان دایە لە (آیەت) (صَنعةُ الإحْتباك)هەیە (عبارەت)وای لێ دێ (لا أمْلكُ لكُمْ ضَراً ولا نَفْعاً وَلا غَياً ولا رَشَداً) لە هەر لایە (مُقابل)ی فرێدراوە؛ ئەوەش لە (بدائع)ە هەرچی هەیە: چ (انس)چ (جن)چ (قریب)چ (بعید)(اهتدی)بە (رسول)بکەن؛ (امل)ی (نفع)و (ضرر)و شتی واتان پێ نەبێ. هەرچەند (کلام)ی (مُعجِز)(بیان)ی زۆر (مُؤَثِر)ە (لکن)(تاثیر)ی (دعایە)چ بە (لَهُ)چ بە (علیه)(انکار)ناکرێ؛ (أمّا اساس)ی (القا)ی (رکن)ی لە خوایەوەیە وە بە گوێرەی (إستعداد)ئەگۆڕێ؛ (حقاً رسالەت)وایە؛ (رسول)بۆیە نیە خزم و قوم و قبیلەی خۆی بهاویتە ضمانەتی هەرچی ئەکەن بێ کەن (عَلَیّ)شەق و شەلاق؛ وە(حساب)و (کتاب)بۆ خەڵکی بمێنێتەوە وەکی (خدمە)ی: (نمل)و (نحل)و (أرضه)﴿قُلْ: إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ﴾ کەس (امان)م نادا لە خوای نامپارێزی؛ (في القاموس): (اجاره: انقذه واعاذه)﴿وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا﴾ (المُلتَحدُ: المُلتَجئ)کەس نیە (غیر)ی ئەو لە پەنای خۆم گرێ: من کە (رسول)ی ئەوم وام؛ ئێوە (بطريق الأولى)(تعجب)ئەکەم لەگەڵ ئەو (نفی)(الهی) (بعض)ێ (احادیث)یان چۆن هەڵستیە هیچم بە چەنگ نیە ﴿إِلَّا بَلَاغًا مِّنَ اللَّهِ﴾ (وَحی)ئەنێرێ؛منیش (تَبلیغ)ی ئەکەم ئەوی (ایمان)بێنێ بۆ خۆیەتی؛ ئەوی (ایمان)نەیەنێ لە(عَلیه)ی خۆیەتی.

(مکافات)و (مجازات)(عائد)ی خوایە ﴿وَرِسَالَاتِهِ﴾ (رسالەت)ی خوای بە (اعتبار)ی (رسول)(تعدُّد)ئەکات؛ ئەوی (رسول)آن فەرمووتیان؛ چۆنیان (دەعوەت)کردیە چۆن جواب درانیەوە؛ ئەویشتان (تبلیغ)ئەکەم؛ (الهیات)و (سمعیّات)تان پێڕائەگەیەنم؛ ئەوەندەم (تفویض)کرایە؛ لەسەر ئێوەش (لازم)ە (ایمان)و (عمل)ی (صالح)لێرەش (مُشوّشی)یە لە (بین)ی (مُفسّر)آن ﴿وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾: مؤمن و (کافر)؛وا بزانم ئەوەی (مثقال)ە (ذرّە)کی (ایمان)بە خواو (رسول)هەبێ، بە (قَصد)ی ڕقە باری وە ڕقی لەگەڵ خوا و (رسول)ی گوناە ناکا؛ انسان و (حیوان)ە، (مَیل)ی (شَهوات)ی زۆرە؛ وا ئەبێ لە (شدّەت)ی (مَیل)ی (سَوق)ی ئەکا خواو (رسول)ی بەدڵدا نایە، لە هەموو شت (غافل)ە (إلاّ) لە (بُغیەت)و ئارەزووی خۆی؛ ئەوی بە ڕقەباری (عصیان)ی (بار)ی بکا هەر (کافر)ن؛ ئەوی بەو تەرزە (عصیان)ی خوا بکا ﴿فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ (افراد)و (جمع) لەبەر (لفظ)و و(معنا)یە ﴿أَبَدًا﴾ بێ (نهایەت)بە (سبب)ی (کفر)و (عِصیان)یان و (قُوەّت)ی خۆیان و (ضعف)ی (رسول)و (مسلمان)آن، بێیار و یاوەرییان (استکبار) ئەکەن، بە بێهێزیان ئەزانن گەمەیان پێئەکەن ﴿حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ﴾ لە (غلبە)ی (رسول)ی خوای وە لە (آخرەت) ﴿فَسَيَعْلَمُونَ﴾ (علم الیقین)ناگاتە (سَوف)ە یا بە (تأکید) ئەزانن ﴿مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا﴾ (مَلاذ)و (مَلجأ)ی ئێمە خوایە، (ناصِر)و (مُعین)مان ئەوە، بە (هدایەت)ی (سُبحانی) ڕۆژ بەڕۆژ ئێمە (زیاد) ئەکەین، بە (قُوەّت)ئەبین؛ ئێوە کەم ئەکەن بێهێز ئەبن؛ لە ڕۆژی (جزا)ش بۆ ئێوە (لا قوة ولا ناصر، لا کبیر ولا قلیل)ئەو (وَعد)ەکەی ئەبێ؟ ﴿قُلْ: إِنْ أَدْرِي﴾ نازانم ﴿أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا﴾ ئایا نێزیکە؟ یا دوورە؟ خودا (مُدّە)یە دووری بۆ دادەنێ؛ (أمَدْ)وەکی لە (قاموس)ئەڵێ، بە (معنـا)(غایـەت)و (مُنتهـا)یـە؛ دیـارە (ذي الغايـە)(بعـض)یَ کـورتن

(نهایەت)یان نێزیکە؛ (بعض)یَ درێژن (نهایەت)یان دوورە لای (زمخشری)و (آلووسی): (أمَدْ)( و ضعاً عامّ)ە لە (قریب)وە لە (بعید)(أمّا) لەبەر (مُقابلە)(بعید)(مُراد)ە ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ﴾ خوداوەندی (کائنات)(غیب)ئەزانێ (علم)ی (غیب)بۆ کەس نیە؛ (عقل)کە (ادراک)ی (كُلّيّات)و (امور)ی (غَیبی)ئەکا لە (ضِمن)ی (مُدرَکات)ی (حسی)(إنتقال)ئەکا، با (حواس)نەبێ؛ بزانین (عقل)چی (دَرك)ئەکا؟ ﴿فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا﴾ لە (کائنات)(بشر)؛ (جن)(مَلَك)(یعنی)(علم)ی (غیب)یان ناداتێ؛ با (بَعضاً)بێ (وَحی)(خبر)یَ (بَعض)ە (امور)ی (غَیبی)یا نداتێ، یا (إلهام)یان بکا؛ (انسان)لە (نفس)ی خۆی (بعضاً)ئەبینێ لەسەر شتێ (غَیبی)سوێند ئەخوا ئەڵێ: وا ئەبێ لەسەر چی وادەڵێ سوێند ئەخوا؟ ئەو (جَزم)ەی چۆن بۆ بوە؟ لێکدەوە نایزانی (مع الأسف) (اکثر)لە (اهل)ی (ایمان)و (حَمَلە)ی (قرآن)وا ئەزانن (ابلیس) (جن) (علام الغیُوب)ن (عَلی الدوام حاضر)و (ناظر)ن بە (آن)یَ لە (مشارِق)ی (أرض)و (مغارب)ی وەک (بَرق)(جَولان)ئەکەن (أولیا)قسەی لێ ناکرێ (عرش)و قورشی لەبەر چاوانە؛ (ما في الضمائر)ی لا (عَیان)ە کەس (مُطلِع)ناکا لەسەر (غیب)ی خۆی؛ (أمّا القیامەت)(فَعَلی الإطلاق) کەس نایزانی کەی ئەبێ؟ (عِلم)ی (خاصّ)ی لە (وەقت)بوونی ئەبێتە (شهود)؛ باقی (أمور)ی (غیبیە)(ممکن)ە، (إطلاع)یان بە سەر (بعض)یَ دابدا (أمّا)بە (إستظهار)و (غَلَبە)با کە فەرمووی ﴿إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ﴾ (معلوم)ئەبێ لە (إیجابات)ی (رسالەت)ە، نە (مُطلَق)، مادام تەک و تەنها بێ (قوەت)و بێ (حشمە ت)ئەیەنێرێ بۆ سەر (أقوام)ی (جبّارە)ئەبێ بەو (نوع)ە شتە (إمداد)ی بدا (أحکام)ی (علوی)و (علمی)(لازم)ە ﴿فَإِنَّهُ يَسْلُكُ﴾ دادەنێ ﴿مِن بَيْنِ يَدَيْهِ﴾ ئی (رسول)﴿وَمِنْ خَلْفِهِ﴾ لە (جوانب)و (أطراف)هەر چەند (قرآن)لە (القائات)ی (شیاطین)ی (جن)(رصد)کرا (امّا شیاطین)ی

(انس)(خالی)نەبوون لە (القائـات)یـەکێ لەوانـە (مسئلە)ی (غرانیـق)ە بـە (القائات)ی (شیطان)(حساب)ناکرێ ﴿رَصَدًا﴾ هێشکچی لە (ملائکەت)آن لە (حین)ی (وحی)(محافظە)ی ئەکا لە (القائات)و (اختلاف)ی (جن)یا خـود (منع)ی (تَجَاوز)ئەکەن لە (حَدّ)لەوەندەی بۆی (معلوم) کرایـە (تجـاوز)نـە کـا وەکـی (قسـم)ێ لـە (حُکمـا)و (علمـا)و (صـوفیّە)شـتە کیـان زانـی ئـەڕۆن؛ (تجاوز)لـە (حـدّ)ی (عقـل) ئەکـەن تێـوە ئـەگلێن گێـژ ئـەبن. بـەو (تَقریـر)ە ﴿لِـيَعْلَمَ﴾ (یعنـی)(جنـابی حـق) (بالفعـل) بزانـێ زۆر جـوان دێ؛ بزانــێ ﴿أَن قَـدْ أَبْلَغُـوا﴾ (رسـول)ەکـانی ﴿رِسَـالَاتِ رَبِّهِـمْ﴾ دیـارە ئـەو (حراسـەت)ە (خـاصّ)ی (رسـول)ێ نیـە؛ ئـەو (ترصـد)ە بـۆ (إمـداد)و (حفـظ)ە ئایـا ئـەتوانن بـێ (غـل)و (غـش)و (القائـات) (تبلیغـات) بکـەن؟ (خالِص)ی فەرموودەی (کبریائی)بگەیەنن (ضـمیر)ی (لیعلم)ەی (قسـم)ێ (عظیم)(راجع)ی ئەکەن بۆ (رسـول)؛ وا بـزانم لەبـەر ئەوانـەی کـە ئـەڵـێن: (جنـاب)ی (حــق)تــا (بِالفعــل)شــت (وقــوع)ی نــەبێ نــایزانێ ئەمــە (أساساً) (قول)ێ (غلط)ە (جهل)ێ (عظیم)ە، ئـەو (رسـول)ە کـوو ئـەبێ؟ کـێ ئـەی‌نێرێ؟ کـێ (خبـر)ی ئـەداتێ بـە (أمـور)ی (جزئیـە)ی (غیـرە) (واقعە)؟ ئەوەی (قول)بە (رسالەت)و (جزا)بکـا نـاتوانی ئـەو قسـەیە بکـا. (عِلم)ی (کبریائی)(واقعاً) (زەمان)ی نیە (لکن معلوم)ی (زەمانی)یـە (قبـل الوقوع) ئەزانێ؛ ئەبێ (حین الوقوع) ئەزانێ، ئەوا بوو (بعـد الفـوات)ئـەزانێ بووە! (امامی رازی)ئەوەی ئێمە (اختیار)مـان کردیـە (اختیـار)ی فـەرمووە، وە ئـەڵـێ: (اختیـار)ی (اکثـر)ی (محقـق)آنـە وە (جـواب)لـە (شـبە)کـەی ئەداتـەوە (زمخشـری)ش ئەفـەرموێ: (لیعلم‌اللـه)(أمـاإبـن‌کـثیر) و (سـیدی آلووسی) (اختیار)ی (رجوع)ی (ضـمیر)بـۆ (رسـول)ئەکـەن (فـي الحقیقـة) (تکلّـف)ی تیایـە ﴿وَأَحَـاطَ﴾ (جنـاب)ی (حـق)(بالإتّفـاق) ﴿بِمَـا لَـدَيْهِمْ﴾ (رسول)آن (حُرّسە)آن ﴿وَأَحْصَـى كُلَّ شَـيْءٍ﴾ لـە (کائنـات) ﴿عَـدَدًا﴾ یـەک یـەک ئـەیان ژمێـرێ (عِلـم)ی بـە (ذرات)ی (موجـودات)(لاحـق)ە (عِلـم)ی

(محـیط)بـۆ (غیـر)ی خـوا نـابێ زێـرا (علـم)ی (مُحـیط)(مُقتضـی)ی (ألوهیەت)ە نە (نُبوەّت)نە (رسالەت)نە (ولایـەت)نـە (مَلَکی)پـەکی لەسـەر (علم)ی (محیط)نە کە وتـووە (رسـول)ئەگـەر شـتێ نـەزانی (مـادام) وابـێ (عِلـم)ی (محـیط)نابەخشـرێ، (ولَـوْ)یـەک (آن)بـێ بـۆ (غیـر)نـابێ (علـم)ی (غیب)ی (حقیقی)کە (مُقتضی)ی (علم)ی (عالم)بێ باز بـۆ (غیـر)ی خـوا نـابێ (وَلـی)(کرامـەت)ی هەیـە (خَـبر)لـە (غیـب)ئـەدا (جَـزم)ی هەیـە (أمّـا)نـازانێ چۆنـە چـۆن نیـە؟! وە (حتـی)(فاسِـق)ێ زۆر (فاسـق)(نـوع)ە (خبر)ێ ئەدا وە دێتە جێ. (إیمـان)م بـە (کرامـەت)ی (أولیـا)هەیـە، خـۆم دیمە (لکن) نابێتە جـای (اعتمـاد)وە (قواعـد)ی پێهـەڵناوەشـێ (خطـأ)ی (عمومی) لەو (نقطە)دایە بە (روحانیات)دەست لە (مادیات) هـەڵنـاگیردرێ (معهذا) (کشفیات)یان بۆ ئەمرۆ چ کەڵکی نەگرت من (اعتقـاد)م بـە (شـێخ إبن عربي)هەیە (أمّا)(کشـف)ی (أرض)ی (سمسـە)ی بـۆ ئێمـە (فائـدە)ی نەبوو، خۆزی پێش (خرستۆف)ی (کشف)ی (امریقـا)ی کردیانـە زۆر چـاتر بوو، خۆزی بـۆ (اتحـاد)ی (أمـەت)(سـعی)یـان کردبـا (بحـث)لـە (إتّحـاد)و (حلـول)ی (کبریـائی)(سُـبحانَهُ عَمّـا یَقُولـون)هـەر نـەکرابا؛ (حقّـاً تجـاوز)ە (معلوم)ە بزر نیە (اجانب)بە (إختراعات)ی (مادی)(طبیعی) بەسەر ئێمـەدا (غالب) بوون (کرامات)بە (امداد)مان نەهات (اولیـا)بۆیـە (اولیـا)نیـە بێتـە (مالک)ی (نفع)و (ضر)(حاشا)، (فاعل)ی (مایشاء)و (حاکم)ی (مایریـد)؟ (کلاّ)؛ ئەگەر بە ڕاستی (قرآن) بزانین و (اقتدی)ی پێبکەین؛ (حاجەت)مان بە (لَوح المحفوظ) نیە ئەمە وا. (عُلما)یـان قسـەیان لـە (جـواز)و (عـدم)ی (نکاح)ی (جن) فەرمووە،لای (بعض)ێ دروستە، (مُطلقا)چ نێری (إنسـان)و مـێی (جـنّ)ییـان چ (بـالعکس)چ (شـاهد)لـەوان بـێ. چـی لـە خۆمـان؛ (مختار)ی (قسم)ێ لەوانە ئەوەیـە، دروسـتە (شـرط)ی (شـاهد)لـە خۆمـان بێ؛ وە ڕێی (إنکاح)ی ژنە (إنسان)بە پیاوی (جن)بەر (تهمەت)و دەرگـەی (فساد)ئەکرێتەوە قسەی ناشیرین مامۆستا (ملاأحمد) (ڕەحمەتی خوای لێ

بێ) فەرمووی: پەلەیان لەگەڵ کردم، کچەکەم لێ مارەکەن ووتم: باشە، بە (شرط)ی (شاهد)لە خۆمان بێ (قبول)یان نەکرد، ووتیان: (شاهد)یش لە خۆمان بێ منیش (قبول)م نە کرد مامۆستا پیاوی درۆ نەبو. بابیشم لە (طرف) (جن) نەساغی یەکی بەسەر هات، نازانم نووسیتم یان نا؟ (مجملاً)شەوێ دوو (اَجِنّ)ە دێنە (خدمەت)ی ئەڵێن: بۆ (سؤال)ی (طلاق)ێ هاتینە (خدمەت)ئەفەرموێ: ئێوە (ملا)تان نیە؟ (عرض)ی ئەکەن بەڵێ؛ هەیە؛ (أمّا)(حظ)مان کرد بێنیە (خدمەت)توو (تقریر)ی (طلاق)ەکە ئەکەن؛ (ملا) ئەفەرموێ: (طلاق)تان کەوتوە؛ ئەوانیش لایان گران ئەبێ (عرض)ی ئەکەن ئەمە ئەچینە هۆدەی بن دەرکە (إنتظار)ی (جواب)ێ خۆش ئەکەین سبەی چوومە (خدمەت)بابم (مضطرب)م دیت؛ تا پێنج ڕۆژان لە (عذاب)ێ دابووم خودا بزانی (وەقت)بوو، دڵم دەرچی لە غەمان ئەی فەرموو: (فتاوی) بێنە تەماشاکە (تحقیق)ی ئەو (طلاق)ە بکە (تُحفە) بێنە بە (دِقّەت) بێ نۆیێ ڕۆژێ فەرمووی:(تلغراف)ی بابم بۆ هاتیە لە (مکّە) ئەفەرموێ: (دقّەت)کە لەو (مسئلە) ڕۆژی پەنجەم پاش نیوەڕۆ فەرمووی: کێ لێرەیە؟ (عرض)م کرد: بەندە فەرمووی: چا بوومەوە وە (ثم الحمدلله)! پاشان (ماجری)ی بۆگێڕامەوە وە (دائم) ئەیفەرموو: ئاگاتان لەو میوانانە بێ لەهودەی بن دەرکەی ئەچووین چ میوان نەبوو. فەرمووی لەو وەقتەدا وامزانی چوونە (خدمەت) بابم (نوعاًما) (شکات)یان لە من کردبوو؛ ئەویش (مخابرە)ی لەگەڵ کردم؛ تائەمڕۆ (جواب)م دانەوە. بە (طلاق) نەکەوتن (مسرور) بوون ڕۆین، وەلێم گەڕان وە بابم (ذات)ێ نەبوە هیچ (خلل)ی هەبێ، لەهەموو (جهەت)(قُوا)ی (بَدنی)و (روحی)و (دەماغ)ی زۆر (کامل) بوو. (تفسیر)ی (سورە)ی (جن)زۆر هەڵ ئەگرێ، با بە ئەوەندە (اکتفا)بکەین.[1]

---

[1] — تەواو بوو سبەینەی ئێکشەموو (٢٦)ی (محرم)(٢٣)ی ئەفرەنجی (١٠)ەی (شبا×)ی (رومی)(سنە)(سنە)(والسلام علی مَن اتَّبع الهُدی).

(نوبەت)ی (تفسیر)ی (سورەت)ی (المزمل)ە (مکیە)بێ (استثنا)یا بە (إستثنا)ی (بعض)ێ (آیەت)؛ (آیات)ی (١٨)ە (١٩)ە (٢٠)هەرچی هەیە (أهمّ)ی (مهمات) لای (حقیر) (ربط)و (مناسبە)ی (آیات)و (سورە) لێرە (إمام) چی لێ نەفەرمووە: (زمخشری) (بیضاوی) (ابوالسعود) گوێی نادەنێ وەکی (ملا)یەکانی (نُقّال)؛ (سیدی آلووسی)ش چی وای (ذکر)نە کردیە، بەڵێ (نوع)ە (مُناسبە)کی هەیە لەگەڵ (لَما مَّامَ عبدالله) (أمّا) زۆر بە (قوەت)نیە، منیش ئەڵێم: (معلوم)ی (اهل)ی (حدیث)ە (جناب)ی (رسالەت)لە (اوّل)ی کەمێ ئەترسا (العیاذ باللە)لە (جنەت)چ جایە (جنەت) (جنابی حق)(جن)ی بۆ (مسخر)کرد (ایمان)یان پێهێنا دوای ئەو (صدفە) (طبیعی) ئەوانەش وە (جن)ی دیش هاتوونە (خدمەت)ی بۆ (استماع)ی (قرآن)و (اخذ)ی (احکام)دوای (نزول)ی (سورەت) (صاحب)ێ (رسالەت)خۆی لە (لباس)ی پێچاوە وەکی بنوێ (تامل)ی لە (احوال)ی (جن)فەرمووە: بۆ (جهەت)ی (تبلیغ)و (دەعوەت) لەو (وەقت)ەدا.

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿یَا أَیُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾ی بۆ (نازل)بوە؛ (یعنی) ئەوانە (استماع)ی (قرآن) ئەکەن وە هاتیان بەشەو ئەبێ؛ خۆیان دێن لە (وەقت)ی (قرائەت)ی (قرآن) لە شەونوێژدا (اخذ)ی (احکام)ی (دینیە)ئەکەن وە وەکی (إنسانەکان) (قرآن)یشیان (محفوظ) ئەبێ؛ ئەو (مناسبە)کە من (عرض) ئەکەم (نظر)بە (قرآن)ی (مُدَّون)ە (ذاتاً) وتوومە، لەگەلەک جێ: (آیات)ی (قرآن) لە (سبب)ی (نزول) لانەدرێ لە (موقع)ی خۆیان (ربط) ناخۆن بێ (مُناسبە) ئەمێنین (بناء علی هذا) ئەڵێین: ئەی (رسول)ی (انس)و (جن) خۆت لە نوین وەرمەدە ﴿قُمِ اللَّیْلَ﴾ هەستە لە شەودا شەو بێدار بە بۆ نوێژو (قرائەت)ی (قرآن) (ذاتاً) لە (أول)ی (إسلام) (مقصد)ی (أعظم) (قرائەت)ی (قرآن) بوە (إنَّ قُرآن الفَجرِ کانَ مَشْهُوداً) یەکێ لە (شُهودات)ی

ئەمە بوە کە (جن)لە نوێژی (فجر)(استماع)ی (قرآن)یان کردو (إیمان)یان هێنا ﴿إلا قَلیلاً﴾ (اکثر)ی بە (خبر)بە کەمێ (استراحەت)بکە وە ئەتوانم بڵێم: لەبەر (اتهام)و چەنەبازی (اعدی)(ماجری)ی (جن)یانی بە (علنی) دیبا دەنگی نەدەکرد (أمّا وحی)هات (مجبوراً) (اعلان)ی فەرموو بەو (نوع)ەی کە فەرمووی (مفسرین)ی (کرام) (خلاف)یان لەبەر ئەو (استثناء) بەو (إبدال)ەی ﴿نِصْفَهُ﴾ کە (بَدل)ە لە (قلیل)ی کأنّە ئەفەرموێ (قُمِ اللیلَ إلاّ نِصْفَهُ)(أوِ أنقُصِ منْهُ) لەشەوی (مُقیَّد) بە (إستثناء) یا لە نصفی ﴿قَلِیلًا﴾ کەمێ ﴿أَوْ زِدْ عَلَیْهِ﴾ لەسەرچی؟ وەکی (ضمیر)ی (مِنْهُ)ی (مراجعە)ی گشت (تفسیر)ەکانم کرد چم نەکەوتە بەر دڵ ئەڵێ (جباب)ی (حق)(کلمە)یە ئەهاوێتە مەیانە بۆ (امتحان)ی (نظار) بەڵکوو لە(آخر)ی (سورەت)بێتە دەست؛ دڵمی پێدامەزرێ. با ڕانەوەستین (دوام) کەین لەسەر (تحریر) ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِیلًا﴾ (قرآن)ی نجوونە بە (تأنی)و (تدبُّر)و (واضِح) ئەوی ئەیبە چاکی تێبگا بنۆڕە (رَتَّل) لە (قاموس) وا دەرئەکەوی زۆری (نازل)بووبێ ئەگەر زۆر زوو لە(أوائل)ی (رسالەت) ئەو (سورەت)ە نازل بووبێ ئەبێ (نظر)بۆ (آتی) ﴿إِنَّا سَنُلْقِی عَلَیْكَ قَوْلًا ثَقِیلًا﴾ (حکم)ێ گرانی (مرتل)بێ (نظراً للعقل) لە (طوق)ی (بشر) دووربێ، (قوەت)ی (بشری)هەڵی نەگری لام (عموم)ی (رسالەت)ە لەو (تکلیف)ە گرانتر (تصور) ناکرێ (شخص)ێ (مقابل)ی ئەو (کائنات)ە ئەو (أدیان)ی (مختلفە)(طبقات)ی (متفاوتە) ڕاوەستی (شخص)ێ لە (قوم)ێ (أمی) (أکثر) ژێردەست (دەعوەت)ی (کسری)ی وە (هرقل) بکا بۆ (إیمان) پێهێنان و (متابعە)ی بنۆڕە (تصور)کە چەند گرانە! (ذات)ێ (أمی) (علما) و(حکما)ی (أرض)(دەعوەت)کا بۆ (متابعە)ی (اللە) چەند گرانە، چەند (صعب)ە؟ بەو گوێرە خۆت (مهیا)کە وەکی کوردی ئەڵێ: خەوو خۆراک لەخۆت (حرام)کە ئەوانیتر چەند فەرمایشیان هەیە؛ بۆ (توجیە)ی (ثقل)(بعض)ەکیان زۆر (ثقیل)ن (مناسبە)یان لەگەڵ

کارهُونَ) ﴿إلاَّ مَنْ تَوَلَّى﴾ (لکن) ئەوەی (إعراض)بنێ ﴿وكَفَرَ﴾ (أنَّهُ) ببێتە (راسخ)، (دوام)ی لەسەرکا نەگەڕێتەوە، بەڕەلاّ ناکرێ، بێ پاداش نابێ ﴿فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الأَكْبَرَ﴾ بە (نار)ی (كُبرى) وە (قَهر) و (غَلَبة) و (تَسلُّط)ی (جناب)ی (حَق)، لەو (نَوع)ە وەکی ئەفەرموێ:" (لا إكراه في الدِّين) " وە(ممکن)ە (إستثنا) (مُتصِل)بێ، (يعني) ئەمڕۆ توو لەسەروان (مُسلَّط)نی، (قُدرەت)نیە، پێ یان ناوێری، (أمَّا) ئەبێ دوای (تَسلُّط)ی توو، ئەوی بە (عذاب)ی (أصغر) گرفتارو (أسیر) و (ذلیل)بوو، کوژرا، خوداوەندی (أعظم) (عذاب)ی ئەدا، بە(عذاب)ی (أكبر)، ئەمە زۆر جوانە وە لە (تَصريح) نەکردن، بە(سیطرە ت)ی (جناب)ی (رسول) (ﷺ)، (نُكتە) یە (لطیف)ی تیایە ﴿إِنَّ إِلَيْنَا﴾ هەر بۆ (طرف)ی ئێمەیە ﴿إِيَابَهُمْ﴾ (رُجوع) یان، کەسیتر (مَرْجِع)یان نیە. ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾ (حساب) یان هەر لەسەر خوایە، (آلە)ەو مالیهە نین هەرچەند (حساب) (بالفعل) دوای (إیاب)ە، (لکن إنحصار)یان وێکراپە، مەگەر بلێین:"(حَصر)ە کان ئەوێ ڕۆژێ (بالفعل) بە (ترتیب) دەرئەکەون. هەرچەند ئەلێن:" (الكريمُ إذا حاسبَ، سامَحَ)" (لکن إنسان)، (إنسان)بێ، (کریمی) ئەکاتە (مُقَويٌّ إطاعە)و مل کەچی، نای کاتە بەهانەیی (عِصیان)و سەرکەشی، خوداوەندی (کریم) بە (کَرم)ی خۆی، چارەی ئەو (قَحط) و (غَلا)یە بکا، ئاگری ئەو (شەڕ)ە (عَن قَریب) بە(خێر) بکوژێنێتەوە، بارانەکی (ڕەحمەت)مان بۆ بنێری، زۆر سەخڵەتیە (إن تُعَذِبْهُمْ فَإِنَّهُمَ عِبادُكَ، وَ إِنْ تَرْحَمْهُمْ فَإِنَّكَ اَنتَ اَلْغَفُورُ اَلرَّحِيمُ) (اَلبَرُّ الكَرِيمُ)، (اَلْحَنَّان، اَلْمنّان، يااَرَحْمانْ!)[1]

---

[1] — تەواو بوو (تفسیر)ی (سورە)ی (الغاشیە) پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دووشەموو، سێ ی مانگی(ربیعی ثاني)، حەفتی (نیسان)ی (ڕومی) .

## (سَوره)ى (الفَجر)

تۆرەى (تفسير)ى (سَوره)ى (الفَجر)ە، (بِنا) به (قَـول)ى (جَمهـور) (مكيّـه)، لـه (علـى بنـى أبـي طلحـة) (نقـل) ئەكـەن، ئەفـەرموىّ:" (مدنيـه) " (واقفـاً) (تفسـير)ى ئەوانـەى سـوێنديان پـىّ خورايـه، (قسِـم)ەكـى، ئەگـەر (سـورەت) (مَدنى)نـەبىّ، زۆر دوورن (عـدد)ى (آيـات)ى (٢٩) لاى (بصـرى)يـان، (٣٠) لاى (كَوفي) يان، (٣٢) لاى (حجازى) يان، نازانم (سبب)ى چيه؟ (إبن الجريـر) گـوىّ ناداتىّ، (مكيه)؟ (مدنيه)؟ (عدد)ى (آيات)ى (سُوَر) چەندە؟ چەند نيه؟

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالْفَجْـرِ(١)وَلَيَـالٍ عَشْـرٍ(٢)وَالشَّـفْعِ وَالْـوَتْرِ(٣)وَاللَّيْـلِ إِذَا يَسْـرِ﴾ لەبـەر (إختلاف)ى (مُفسّـرين)ەن بـه (يَقـين)ى نـازانم (مُـراد) بـه ئەوانـه چـيه؟ (فجـر) (مَعروف)ە، يا (وقت)ى (بَيان)ە يا (بياض) و ڕووناكى سـەر لـه سبەينان، ئـى بەيانى، وە (تخصـيص)ى بـه (فجـر)ى (يَـوم)ىّ (مُعَّـين) (قرينـه)ى لەسـەرنيه، (جَمهور) لەسەرئەوقسەيه، (نقـل) لـه (إبـن عبـاس) و (مجاهـد) ئەكـەن: (مُـراد فَجـر)ى (يَـوم)ى (نَحـر)ە، (أوّل) ڕۆژى جيـژنى (قوربـان)ىّ (عكرمـه) ئـەڵىّ:" (فجر)ى ڕۆژى (جمعـه)يـه " (ضـحّاك) ئـەڵىّ:" ئـى (ذى الحجـه)يـه " (مُقاتـل) ئەڵىّ:"ئى (لَيل)ى (جُمعَ)ە، (لَيلة)ى (مزدَلفة)ى دەڵێنىّ " باز لـه (إبـن عبـاس) (نقل) ئەكـەن: (فَجـر)ى (مُحَّـرم)ە . (مُحَّـرم) گۆيـا (فجـر)ى (سـنه)يـه، سـەرى ساڵە. ئـەوە لـه (زمـان)ى (إمـامى عُمـر) بـوو، چـۆن لـه (أوائـل)ى (رسـالەت) سوێندى پىّ ئەخورىّ؟ له (قَتادة) و (إبن عباس) (نقل) كرايـه: هـەمووى ڕۆژىّ، نەك (أوّل)ى، باز له (إبـن عبـاس)، نوێـژى سـبەينه، (قيـل): دەركـوڵێنى ئـاوى كانى لەبەردان، وە (لَيال)ى (عشر)، (أوّل) له مانگى قوربان، لەسەر (فضـل)ى ئەو (عَشر)ە (حَديث) (نَقل) ئەكەن، (آمنّابه) (لكن) (دَلالەت)ناكا، كه (مُـراد) — لێره — ئەوە .(عشر)ى (أخـير)ى (رمضـان)، (حـديث)ىّ (نقـل) ئەكـەن لـه (أُمّ المـؤمنين) كـه (جنـاب)ى (رسـالەت پـەناه)(ﷺ)، خـۆى ئامادەكرديـه، ئـەو (ليالى)يەى (إحيا) ئەكرد، (أهل)ى خۆى به (خَبر)دێنـا، باشـه، بـاز (دلالـەت)ى

نیە وە (ممكن)ە وەكی (إعتراض) یـان گرتیـە، لەبـەر (إعتنـا) بـە (لَیلـةُ القـدر) بووبێ .(عشر)ی (أوّل) لە (رمضان)، (عشـر)ی (أوّل) لـە (محـرّم)، (عاشـورا)ی تیایـە، لەبـەر گـەورەیی (حـقّ)ی سـوێند پـێ خـورانی هەیـە. (زمخشـری) ئەفـەرموێ:"بـۆ بـە (نَكـرة)یـی (أدی)كرایـە؟ ئـەوانی دی(معرفـە)ن، لەبـەر (تعظیم)" یەكی تر ئەڵێ:"(عبادەت)و نوێژ لە شەوانە" (معنا)مان تـەواو زانـی، بێینـە سـەر (قرائـەت)ئـان، (وَلَیـالِ عَشْـرٍ) بـە (إضـافة) بـێ (ێ) . لـە(إبـن) (روایەت)كراوە (بعض)ێ:(وَلَیالِ عَشْرٍ)، ئەوجا بێینە باسی (تذكیر) و (تأنیـث)، ئەبایە نەفەرموێ:"(عَشْرٍ) وەك: (أربعةَ أشْهُرٍ وَعَشـراً) زێـڕا (عَـددی) (مَعلـوم)ە، لە (سێ) تا (دە)، (عَلامە ت)ی (تَأنیث) بۆ (مُذكّر)آنە (علامـەت)ی (تـذكیر) بـۆ (مؤنث)آنە، بەڵێ: (إنقلاب)ە، وەكی ئەو (أيّام)ە، (ملائم)ی پیاوەتی بـۆ ژنانـە، یەكێ (مَوصوف مُقَدَّر)ئەكا، (أیّام مُقَدَّر) ئەفەرموێ، (قسم)ێ ئـەڵێن:"(فَـرق)ی نیە، وەك (بِستٍّ مِنْ شَوّال)ە" خۆزی (عربی)ش وەكی زوبانەكانی تر (تذكیر) و (تأنیث)ی كەم (رعایەت)كردبایە، ئـەتوانم بلـێم:"(لوغـەت)ی كـوردی، (أصـلاً) (فَـرق)ی تیانیـە، دە شـەو، دە ڕۆژ، دووپیـاو دوو ژن، پیـاو سـێ، ژن سـێ . وابزانم (أساساً) نێرومێ یان لێك (مُمتـان)ن، (حاجـەت) بـە (تـێ) و (مـێ) نیـە، (وَالشفع وَالوَتر)، (أوّل) ڕۆژی جەژنی (قوربان) وە ڕۆژی (عَرفة)، نوێژ (بعض)ە كـی تـاقن، (بعـض)ێ جـووت، هـەر (مغـرب) تاقـە، ئەوانیـدی گشـت جـووتن، مەگەر(وَتر)یش (حساب)كەین (أعداد) گشتی (زَوج)ە و (فَرد)ە: (اَلْعَدَدُ إمـاَ زَوجٌ أوْفَرْدٌ) (مخلوقات) (شَفع)ەو (وَتْر)ة، (كائنات) (ذكر) و (أُنثی) جـووت، (خـالق) (وَتر) تاق و تەنها، (شـفع) و (وتـر)ی (لیـل)ەكـانی (لیـال)ی (عشـر)، (أیـام)ی (عاد) ڕۆژی حەوت، تاق، (لَیالی) هەشت، جـووت، ئەمـەم لا (مُناسـب)ە لەگـەڵ (آیة)ی (آتی) (أبواب)ی بەهەشت(أبواب)ی (نار) لە (إبـن زوبـیر)(نقـل) ئەكـەن، ئـەو (وقـت)ی (أمـیر المـؤمنین)بـوو، لەسـەر (منـبر) لـە (جـواب)ی (سـؤال) فەرمووی:"دوو ڕۆژی (أوّل)ی (أیّام التّشـریق): (وَمَـنْ تَعَجَّـلَ فِي يَـوْمَيْنِ فَـلا إِثْـمَ عَلَيْهِ) (وَتر)ە، (آخر)ی (وَمَنْ تَأَخَّر فَلا إثْـم عَلَيْـهِ)ی یـە، (ممكـن)ە هـەر (سـێ)

ڕۆژی (مَراد) بێ، (وَتـر، أسمـاءَ الله)یەکـە نـەوەد و نۆیـە" (أمّـا نَفـع)ی (بَیـان) نەکردیە،(سیدی آلوسی) ئەفەرموێ:" (صاحب)ی (کتابُ التّحریرِ والتَّجیرِ) سـی وشەش (قَول)لە (معنا)ی (شفع) و (وتر)ی (نقل) کردیە، (صـاحب)ی (کشّـاف) ئەفـەرموێ:" نزیکـە، هـەر(أجنـاس)ی (شَـفْع) و (وَتْـر)ی ئەکـەوێتێ " (یَعنـی) (إطلاق)یان ئەکرێتە سەر، (ذکر) یان کردبێ یان نا، پـێ یـان (مشـغول) نـەبێ، وە (إلاّ) (ممکـن)ە بلّـێین:" (شَـهور)ی (عربـی) و (أفرەنجـی)یـە، (هلالـی) و (شمس)یـە، (بعـض)یێ تـاقن، (بعـض)یێ جـووتن، یـا(بَـروج)ی (إثنـا عشَـر)ە و (سَبع)ەی (سّیارة)، یا (عناصِر) و (أفلاك) چوار ونۆن، یاخود دووچاو دوولێو و زوبـانێ، وەکـی بـۆت دێ، تـا ئـەتوانی، تاقمانـە جـووتێ بکـە، (أمّـا نهایـة) (إنسان)ی (ذی حِجر) (حاجِز)ە لەگەڵێ (معنا)ی بێ تام وخوێ (وَالَّيْلِ إِذا يَسرِ) (مَطلَقُ) شەو، هەروەکو لەشەودا، ڕۆیشتن هەیە، شەو ڕۆیشتنیش هەیە، (نالّی) ئەڵێ:

(هەناسەم زولفەکەی لاداو (مەیل)ەکی نەکرد چاوی
نَسیم ئەنگوت و شەو ڕابردو نەرگس هەر لە خەودایە)

(مُجاهد) و (عکرمە) و(کَلبي) ئەفەرموون:"(مُراد): (لَيْلَـةُ النَّحرْ)ە، (حَجـاّج) تیای ئەڕوا بـۆ (مُزدَلِفَـة) " باشـە ئـەوە، زۆر (خَـلاف)ی تیـا نیـە، (لکـن) ئـەی (نَظـار) بـەخواتان سـوێند ئـەدەم ﴿هَـلْ فِـي ذَلِـكَ قَسَـمٌ لِـذِي حِجْـرٍ﴾ لـەوەی (ذکـر)کـرا، سـوێند هەیـە؟ (یعـنی) (لایـەق)ن سـوێندیان پـێ بـوخرێ . لای (أرباب)ی (غفل)، ئەگەر بەدیدەیی (إعتبار) تەماشای کـا، بـە(إعتبـار)ی گـەلێ (مەعنا)یە، کە (مُفسّر)ەکان فەرموویانە، (نَظر) بە (مَقام) و (مُناسبة)، شـایانی سوێند پێ خواردن نین، با (نظر) بە (وجە)یێ دی (حق) یان هەبێ، مـن شـتەکم دەوێ، (مُناسب)ی (حال) و (مَقام)بێ، نە باسی (حَجّ)ە، نەباسـی (رَمضـان)ە، نەقسە لە جەژنە، نە لە (آيّامُ التَّشْریقَ)ە، بـەڵێ: (شـفع) و (وَتـر) (تعـبیر)ی بـە (أیام) و (لیالی) (قوم)ی (عاد) زۆر (مُناسب)ە، لەگەڵ (جواب)ی (قَسم)، (یَعنی مَحلوفُ علیە)ی بەرکەوەر– ئەگیرێ لە (آیة)ی ﴿أَلَمْ تَرَى كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَـادٍ﴾

سـوێند بـە (فَجـر) ئـەخۆم، لێـرە لەبـەر نوێـژ و (سـائر)ی (وَجـە)ی تـر کەفەرموویانـە، نـا، لەبەرئـەوە (علـی الاکثـر) (عـذاب) لـە (وەقـت)ی (فَجـر)ێ هاتووە، (إمامی علـی) (وَفَـارَ التَّنـوُّرُ)بـە (طلـوع)ی (فجـر) (تعبیر)ئـەدا، ئەمـە (مُناسب)ە لەگەڵ (تعذیب)ی (قوم)، (حتّی) (أکثر)ی بەسەر دادانـی (عـەرەب) لەبەری (بیان) بـووە، (هکـذا لیـال)ی (عشـر) ئـەبێ (لیـالی)یـە (هکـذا)ئـی بـێ، (وقـایع) و (حـوادث)ی (مُـدهش)ی تیـا (واقـع) بووبـێ (عشـر)ی (ذی الحجـة)، (عشر)ی (محرّم)، (عَشر)ی (أوّل) یا (آخر)ی (رمضـان) چـی وایـان تیـا (واقـع) بوە؟ لێرە (لایـەق)بـێ، سـوێندیان پـێ بـوخرێ ! بـەڵێ گـەورەیی (عبـارات) و (شعائر)ی (إسلامی)یان تیا (إجری)ئەکرێن (لکن بَعـدَ تقـر الـدینِ والإنتشـار)ی .
ئەوانـە کەشـەو ڕائەکشـا، بـە (راحـەتی) ئەنووسـتن، بـێ غـەم و هـەواس، بـێ (خَوف) و (خشیەت) لەخەوا، ئایا (أمین)ن؟ لەو(وەقت)ەدا (عذاب)یـان نەیەتـە سەر ﴿إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ﴾ (إرَمَـن أساسـاً) بـاوکی ئـەو (قبیلـە) بـوو یـا دایکیـان، (قَوم)یێ بووین، (رَحّال) (صاحب)ی ئەستووندەگی ڕەشماڵ، (أمّا تفسیر)ی بـە درێـژی (إنسـان)ە کانیـان، وەکـی (عِمـاد)، لام زۆر خـۆش نیـە، دیـارە چـادرو ڕەشماڵی زۆر گەورەو (صاحب) (أعمدە)ی نایابیان هـەبووە، (عشـایر)ی چـادر نشینی (رحّال)، (علی لإطلاق)، لە خانووداران بە (قُوە ت)و زۆرترن، وە لەهاتۆ و چۆ (غدر)ی زۆر ئەکەن، لەوانەی لەسەر ڕێ یانن، خۆمـان دیمـان، بیسـتمان، (بعض)ێ لە(عشائر)ی کۆچەری ئەوەی بکەوتبایە سەرڕێ یان، لـە دەغـڵ و لـە ڕەزی میـوە، (حیـوان)یـان تێبەرئـەدا، ئـەیان خـواردن، خاوەنیـان هاواریـان ئەکرد، (قَوم)ەکە ئەیان گووت:" ئێـوە دەغڵـی خـۆ و ڕزی خـۆ لەسـەر ڕێ مـە لادەن " لـە (تـأریخ)ێ چـاوم بـە چـادرێ کـەوت، لـەناوی دانیشـتین، چـادرێ (قیمەت)دار، (عجایب نقش) و نیگاری تیـاکرابوو، (عمـود)ی (صـندەل)، تـەوقی زێڕی لە مەیانە بەسترابوو، بـە(خَیـال) وەکـی (خیـام)ی (جَنّـت) ئەهاتـە بـەر (نظر)، (أمّا) ئەو (نوع)ە، بۆ (إنسان)ی نازك و فێری نازو (نعمت)ن ﴿الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ (صِفەت)ی (عاد)ە یا (إرم)ە، بـۆ (عمـاد) (إبـن الجریـر)

پێی (راضي) نیە، (یعنی) (قوم)یٚ وابووین (مِثل)ی یان نە (خُلق)آوە لە ولاّت، ئەگەر (بِلاد) (تفسیر) کرێتەوە، بەشارودیٚ لەگەڵ ڕەشماڵ نوشینی، لام زۆر جوان دیٚ، (زمخشری) ئەڵیٚ:" ڕوایەتکراوە: (عاد) دوو کوڕی بووە، (شَدید) و (شَدّاد)، (إستیلا) یان (غالِب)بوو، (شَدید)مرد، (شدّاد)ماوە، دنیای گرت (ملوك)ها (إطاعة)یان کرد. بەڵیٚ ئەڵێن لە کافران دوو(دنیا)یان گرتووە، (شدّاد) و (فِرعون)، لە (أهل)ی (إیمان) دوو، (سلیمان) و (ئەسکەندەر)، لە(آخر)ی (زەمان)یش (حضرة)ی (مَهدی) قسەیە بیٚ (أصل) و بیٚ(معنا)و نا(معقول) و (مُستحیل)، (واقِعاً أسکەندەر) (مُلك)یٚ (واسع)ی بوو، (مَمالِك)یٚ زۆری گرت، (أمّا دوام)ی نەبوو بۆیان، دوای مردنی (مُلك)ی پارچە پارچە بوو — (شَدّاد) (تعریف)ی بەهەشتی بیستبوو، ووتی:" ئەبیٚ منیش (قصر)و (قصور)و باغ و باغتیٚ دروست کەم وەکی بەهەشت، لە (صحرا)ی (عَدن) شاریٚ (عَظیم)ی (بِنا)نا، سیصەد ساڵی خەریك بوون، تا تەواو بوو، (قصور)ی بەخشتی زێڕوزیو، کۆڵەگەی لە زوربەرجەدو یاقوت، بە(أنواع)ی (أشجار)ی (زینەت)و میوەدار، جۆر جۆیە بارولالە ولالەزار — (شُعرا)ی (إیران) (تشبیە)ی (مواقع)ی زۆر خۆش، بەباغی(إرَم) ئەکەن — (شدّاد) نەوصدساڵ ژیا، کە (بِنا)ی ئەوشارە(عظیم)ە تەواوبوو، بە (کوکبە) و (دَبدَبە) و (مَوکب)یٚ (غالیەت) بە (جلال) و (إحتشام) چوو بۆ باغی (إرَم)، کەمێکی مابوو بیگاتی، خوای (تعالی)ن، (صیحە)یەکی لە ئاسمان بەسەردا ناردن، هەموو مردن، بە (هلاك)چوون — (حکایەت) ئەندەر (حکایەت)، (بعض)یٚ (قصّاص) ئەڵێن:"(جناب)ی (حق) بە (عزرائیل)ی ووت:" تۆو (روح)ی ئەو (کائنات)ە ئەکێشی، (قط) زگت بەکەس سووتاوە؟ پەرۆشی کەست بووە؟ " (عَرض)ی کرد:" (یارَبیِّ) پەرۆشی دوانم زۆر بوو، یەکیٚ ژنیٚ (حامِل)ە لەناو (سفینة)یە دابوو، بایٚ مُخالف هات و (سفینەی) تێك شکاند، ئەهلی سەفینە (غَرق)بوون، ژنەکە لەسەر (لَوحة)یە ماوە، لەو (وقت)ە ژانی هاتیٚ، کوڕەکی بوو، (أمر)ت فەرموو، (ڕوح)ی ژنەکەم کێشا زۆر (مَتأثّر) بووم، نەمزانی منداڵەکە چی لیٚ

هات؟ ئەویدی (شدّاد)، ئەو هەموو (مَصرەف)ەی کرد، ئەو (مَدّ) بەو (نَوع)ە خەریك بوو، (عالَم)ی تیا کەوتە (مَشقّت)و ماندی بوون، تا باغی (إرم)ی دروست کرد، کەهات بچێتە ناوی، (أمر)ت فەرموو، (روح)م، کێشا، زۆر (مَتأثر) بووم، (حظ)م ئەکرد، چووبا ناو (قصر) وباغی، (بَعدة) بمردبا، (جناب)ی (حق) فەرمووی:" بە (عِزّت)و (جلال)ی خۆم، ئەو (شدّاد)ە کە (دەعوا)یّ خوایەتی کرد، ئەو مندالّە بوو، کە لەسەر تەختە ماوە، کەوتە(جزیرە)یە، (مادّة)ی شیرم بۆ (مَسخَّر)کرد، بەشیریّ بەخێوم کرد، دوایە بووە ئەو (نوع)ە (مَلِك)ە، (دنیا)ی گرت، (دەعوا)ی خوایەتی کرد " ئەوشارە ئەو (جَنّە ت)ە (عظیمة) لەو (صحرا)یە، لەبەر (نظر)ی (عالَم) بزربووە، (حتّی) بەو (صحرا)یە دا ئەڕۆن، وەك(سائر)ی (مواقع) ی دی هیچ (حِسّ) ی ناکەن.

جاریّ (ذات)یّ (عبدالله) ناو (إبن قُلاّ بة) لەحوشتری ئەگەڕیّ ئەکەوێتە ناو ئەوشارە، ئەوەندەی پێی توانی، لە (جواهر) و (أمتِعَة)ی (نفیسە)هەڵی گرت (خبر)ی گەیشتە(حضرەتی معاویە)، (أمر)ی دا، هێنایانە (حضور)، (حکایەت)ی بۆ گێڕاوە، (معاویە) (عبدالله)ی نارد بۆلای (کعب الأحبار)، هات، (سؤال)یان لیّ کرد: ئەوە چیە؟ ووتی: " ئەوە(إرَمُ ذات العِماد)ە، لە(زمان)ی توو، یەکیّ ئەچێتە ناوی (إنسان)یّ (أحمر)ە، (أشقر)ە، (قَصیر)ە، وە لەسەر برۆی خالّیّ هەیە، وە(کذا) لەپاژنەی، لەحوشتری ئەگەڕیّ، تووشی ئەو جێگایە ئەبیّ" (بَعْدَهُ کعب الأحبار) ئاوڕی داوە، (إبن قلابة)ی دیت، ووتی:" بەلّیّ،(وَاللّه) ئەوە هەوە" (إلی آخرها) .. (روایەت) لە (إبن مُنَبِّة) و (تصدیق) بەو (صُورەت)ە لە(کَعب)ە، چوویتە نێو (مُسلّمان)ی (معدن)ی (کِذب)، (عالم)ی (إسلامەتی)یان بەدرۆیان گێژکرد.

(إبن حجری عسقلانی)، (سَید الحفاظ)، وەکی (سیْد)ی (نُقّاد): (شهاب الدّینِی آلوسي)، (نقل) ئەکا، ئەفەرمویّ:" ئەوانە بیّ (أصل)ن، (مَوضُوع)ن" (ذاتاً) (روایات)ی (قِصاص)آن (إعتبار)ی پێنیە، (أمّا ذات)یّ وەکی (إمام)وەکی (زُمخشریّ) وەکی (بیضاوی)، (تَصریح) بە درۆیایەتی ئەو (نوع)ە

(أخبار)ە ناکەن، ئەوی شارەزا نەبێ، وائەزانێ ئەو (ذوات)، (قبولّ)یان کردیە، وە (حدیث) (روایەت) لە (رسول الله)(ﷺ) کرایە، (طبیعە ی) بیێ میشکەکان، (شُك) و (شُبە)یان ئەکەوێتە (خاطر) من لە مێژە هاوارمە لەدەست: (کَعب) و (وَهَب)، وەئەوانەی لێ یان وەرگرتینە بۆ نافەرمووی:" (ذَواتُ الأُعْمِدَةِ)؟"(إشارةً) بۆ (إتّحاد)، با(تَوَهُّم) نەچی، وەکی (قوم) و (عشیرەت)ی دی، هەرتیرە سەربەخۆیە، (صاحب)ی خیوەت و خیوەتگاهی خۆیەتی (زمخشری) و جەماعەتێ چەند (قرائەت) لەو (ئایەتە)ە (نقل) ئەکەن، بە(مَعانی) (مُختلفة)، (کیف)م پێ یان نەهات، (نقل)مان نەکردن، ئەوەی بەسەر (عاد)ی و ئەوانی دی هاتیە ئەوەندە (مشهور) و (مَعروف) و (مُتواتر)ن، (أنَّهُ نَصبُ العَین)نن (ناظر) تەماشایان ئەکا، (إمام) شتێ وا ئەفەرموێ ﴿وَثَمُودَ الَّذِینَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾ بەردیان ئەبڕی لەچیا، ئەیان کۆڵی، خانی یان لێ دروست ئەکردن، (قِیلَ):"(أوّل)کەسێ، (قَوم)ی بەردو مەرمەڕیان هەڵ کەندبێ، کردبیان بەخانوو، ئەوانەبووین"، (لکن) ئەمە (معلوم)نیە، گەلێ(أوّلیات) دەڵێن، (لکن ثابت)نین، ئەمڕۆ (مُمکن)ە (عالَم) فێری نووسینە، (عالَم) ئاگاداری یەکن، ئەتوانن (ربط)ی (أوّلیات)بکەن، (أمّا) بێ (رَبط) و (ثَبت) نازاندرێ، (کشّاف) ئەفەرموێ:"هەزارو حەوت سەد (مدینە)یان هەموو لەبەردی دروست کردبوو" (سیّد)ئەفەرموێ:"گومان نابەم ئەو(بنا)یە (صحَّەت)ی هەبێ" لەسەر(تفسیر)ی (سیّد)م نووسی:"(لَعَلَّ کُلّ)ی شارێ لەوان شاران، لەگەورەیی، وەك:(لۆندەرە) و (پاریس)و (بەرلین) بووە؟ درۆ تا گەورە تر بی،جوان و (مقبول)ترە" لە (بێتواتە) خانیەکم دی، دوو نهۆم لەبەردان دروست کرابوو، لەدیوارانی نەقوڕ هەبوو، نەچیدی، هیچ درزو تیکیشی نەبوو، ئەڵێن:"لە(طرف)ی (هەورامان) (أکثر)ی خانووی گەورە گەورەیان لەبەردان دروست ئەکەن، بێ قوڕو بێ گێچ " (قاموس) ئەڵێ:"اَلْجَوْبُ: اَلْخَرْقُ وَالْقَطْعُ" درین وەبڕینە بە(جَواب)ی (سُؤال) ئەڵێن:" (جَواب)" زێڕا(قَطع)ی (سؤال) ئەکا، خۆشە، (بَشری) (أیام)ی ئێمە، (یَعنی) ئەوانەی (بَشر)ن، بە(عِلم) و

(آلات) و (أدوات) چیای (عظیم) پان وبەرین کون ئەکەن، (شەمەندوفەر)ی پێدا دەبەن، لەناوزێ یە، وەکی(دجلە)ی (بغدادی))، پێچکەی بەردان دادەمەزرێنن، پردی وایان لەسەر دروست ئەکەن هەزاران وەکی (قوم)ی (عاد) و (ثمود)ی تیا حەیران ئەبێ، (صنایع)یان (مُدهش)ە وەکەسیش بەو (قُوّة) و (دەعوا)ی خوایەتی، پێغەمبەری (أولیایەتی)ناکا لەو (مُدّة)ی کە ئێمە لەهەموو (جهة) (تَنزُّل)مان کرد، ئەوا هورێنەی خوایەتی و پێغەمبەری ئەکەن، (وادی)، (وادیُ القُری)یە، (منازل)یان لەوێ بوە ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الأَوْتَادِ﴾ (وَتد) سینگە، لەگەڵ (عِماد) (مُناسِب)ە، خێوەت و ڕەشماڵ و چادر ئەستوندەگەی ئەدرێتەبەر، بەڕستەکانی لەسینگان ئەبەسترێ، لەشکرێ زۆری بووە بە (خێمە)و خەڕگاهو بارەگان، وابزانم (شێخ محمد عبدە) بە (أهرام) (تفسیر)ی ئەفەرموێ وەکی:(جِبال)، وە (جِبال أوتاد)ی (أرض)ی، (بَشَر)ی (خالّی) لەهەمووشت (تَرقّی عَجایب) کردیە، (أمّا) لە(بِنا)ی (أهرام)و (مومیا)ی (جد)ی (أموات) نەگەیشتینە(مصری)یان، (حقّا) جای (حیرەت)ە، (مصری)لەگەڵ ئەو (صنایع)ە (عبادەت)ی پشیلەی کردیە، لای (مُقدّس)بوە !

﴿الَّذِينَ﴾ هەموویان، (عاد) و (ثمود) و (فرعون)، ئەوانەن ﴿طَغَوْا فِي الْبِلَادِ﴾ هەریەك لە (مملکەت)ی خۆی ﴿فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ﴾ ئی (مُخِلّ)ی (أمن)و ئاسایش (أفعال)ی (قبیح) و ناشایستە، (غدر) لە (ضُعفا)، (أمّا كُفر) ئەگەر لەگەڵ (عدالەت)و (حُسن)ی (إدارة)بێ، نەبێتە مایەی (فساد)، (مُوجب)ی تێك چوون و (عِقاب)ی (إلهی)نیە. گوناهیش تا گوناه، بۆ خراپەی (مملکەت) (فَرق)ی هەیە، (فَحشیات) و (رقص) و سەماو (دانس) و (شراب) و (قُمار)، ڕۆ چوون لە (لَذائذ) (قَوم)ی بۆلای مێ یی(سَوق)ئەکا، نێرایەتی کەم ئەبێ ﴿فَصَبَّ﴾ دوای (فساد)—بابەکەمێ بێ—﴿عَلَيْهِمْ﴾ بەسەری دارژاندن، بەسەریانی دادا ﴿سَوْطَ عَذَابٍ﴾ قەمچی (عذاب)ی پیامالێن، چۆن ئەوان بە تازیانە لە(مظلوم) و بێ چارەکانیان ئەدا، (صَبّ)ی (سَوط)ی (عذاب) وەکی (إبن جرير) ئەفەرموێ: (مَثَل) لە (عذاب)ی (شدید). لە(بُخاری)شدا شتێ وا

ئەفەرموێ، (شارِح)ی (عسقلانی) ئەفەرموێ:"ئەوە (كَلام)ی (فَرّا)یە"، وە (فَرّا) خۆی (تَوجیە)ی ئەكا، زێرا(سَوط)، (أصل)ی ئەوی، ئەوبووە كە عذاب یان پێدایە. هەر (عذاب)ێ كە (غایەت)بێ لایان (سوط)ی (عذاب)ی پێ ئەڵێن ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ (شێخ)ی (بخاری) ئەفەرموێ:" (إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ)" (رجوع) بەلای ئەوە، (شارح) ئەفەرموێ:" ئەمەش (قَول)ی (فَرّا)یە" (إبن كثیر) (نقل) لە (إبن عباس) ئەڵێ (يَسْمَعُ وَيَرى)" ئەبیە، ئەبینێ، دیارە ئەوی (مُتَرَصِّدْ) بێ، ئەبێ وابێ لای (جَمهور) (تَمثیل) و(تَشبیە)ە، ئەوە كاری(عُلما)ی (بَیان)ە، وە (إمام)ی (مُفَسرین) لەو (طَریق)ە، (زُمخشری)یە، (مُراد) ئاگاداری (جناب)ی (حقّ)ە، (أعمال)ی (عباد)ی لێ گوم نابێ، گوناهكار یا (كافر) قورتارنابێ، وەك كەسێ لە(كمین) دابێ، (مُتَرقّب)ی دوژمنی بێ، كە هات ئەی خاتە (قبضە) یی (قُدرەت) و (قُوّە)یی خۆی، ئەوی (میل)ی بێ، پێی ئەكا، وە(ممكن)ە (عام)بێ، لە (تَرصُّد)ی (حال)ی (عباد): (مؤمن) و(كافر) و (بَرّ) و(فاجر)ئەو (ترصُّد)ە بۆ ئەمڕۆیە، یا بۆ ئاخرەتە، یا عامە؟ (ظاهر) (أوّل)ە، گەرچی (ذَرَّە)یە لە (عِلم)ی خوا بزر نابێ لەهیچ وەختێ، (أمّا سیاق) وای ئێنێ وە (حاجەت)نا (كورسی) خوای لەسەر ئاگری دانێن، وەلەسەری ڕۆنیشێ، وەسوێندی بخوات بە(عِزّة) و (جلال)ی خۆی، ئەمڕۆ (ظالِم)ێ لێم تێ ناپەڕێ . بنۆڕە (تفسیر)ی (إبن جریر) و (إبن كثیر)، خوا (ناقِل)آن (عَفو)كا. (مرصاد) لە (مَرْصَدَ)ە، بە (معنی) جێ ی (تَرقُّب) و (إنتظار) و چاوەنۆڕی یە. (رَصد) خانەی (عُلما)ی (هەیئەت)، لەبەر (مُلاحظە) و تەماشاكردنی، (حركات) و (أوضاع)ی (كواكب) وای ناو لێندراوە.

(مادام عاد) و (ثمود) و (فرعون) (نجات)یان نەبوو، خوا (طُغیان) و(فساد)ی لێ (قبولّ) نەكردن وەهیچیان قورتار نەبوون، ئێوە ئەی (قریش) چۆن (نجات)تان ئەبێ؟ بە(قُدرەت) و (قُوّەت)ی ئەنازن؟ خۆتان لێ گۆڕاوە . لە(سورە)ی (عمَّ)ە ئەفەرموێ:"(إِنَّ جَهَنَّمَ كانَتْ مِرْصاداً) (لازِم)نیە (رَصد)خانە بێ بۆ خوای، لێرە (إبن كثیر) (نقل)ئەكا لە (بعض)ێ: خوای (تعالی) (كورسی)

خۆی دادەنێ لەسەر ئاگری، (ترصّد)ی (کافر)آن، (عاصی)یان ئەکا، کەسی لێ (نجات)نابێ . (کورسی)یە:(وَسِعَ السّموات وَالأرض)ی بێ کوو لەسەر ئاگری جێی ئەبێتەوە؟

﴿فَأَمَّا الإِنسَانُ﴾ (تَفریع)ە لە(آیة)ی (سابق) (زُمخشری) —ڕەحمەتی لێ بێ— ئەو (مقام)ە جوان(شرح) و (إیضاح)ئەکا، ئەوی (لازم)ە بۆ (توجیه)و (دَفع)ی (بعض)یْ (إشکالات)م بە(سؤال) و (جواب)یْ (صریح) دەری ئەخا، (أکثر)ی (ناظرین) تێی ئەگەن، بە(سُهولەت) (فَهم)ی ئەکەن، (أمّا):(أمّا) (مُقابل)ی (مُقدَّر)ی ئەوی، لێرە چیە؟ (أنَّهُ جناب)ی (حَق) (شأن)ی خۆی (بیان) فەرموو، کە ئەو ئەنوارێتە(أعمال)ی (عباد) (لاشك) لای خۆشە، (إنسان) چاك بێ، بۆ (سعادت) و (جلب)ی (رضا)ی (باری) (سعی)بکا، (حال)ی خوای دەر(حق) بە (إنسان) وایە، ئەدی (إنسان)؟(أمّا إنسان) ﴿إِذَا مَا ابْتَلاَهُ رَبُّهُ﴾ (إمتحان)ی کرد، دەرئەکەوێ، چی (إنسان)ێکە؟﴿فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ﴾ (أنّهُ تَحْتَ التّجرِبَه)یە، (حُرمه ت)ی ئەگرێ، ئەی کاتە، (صاحب)ی نازو(نعمه ت) و دەوڵەمەندو (قُدرەَ ت) و (مُکْنەت)، وا دەرئەکەوێ، ماڵ پێدان و دەوڵەمەند کردنی (عەبد)ی (أساساً) لەڕووی (إکرام) و (إحترام)ە، (حقیقةً) لە (کُلّ)ی (زَمان)یْ لە (بَین)ی (جَمیع)ی (مِلَل) و (نَحل) دەوڵەمەندی مایەی (حُرمەت)ە، مەگەر دەوڵەمەندەکی زۆر (لَئیم) و لچڕو (ڕەزیل) و فرۆمایەیی — (خاصّةً) لەو (زمان)ە — بۆ (أهل)ی عِلم (علم) لە (ألزم)ی (لوزمات)ە، کەسێ (ملا)بێ، خوا لە (عمرو) و (زید)ی (مُستَغْنی)کا، (حقاً حُرمەت)ە، بۆ:(علم)، بۆ:(دین)، (ملا)ی (فقیر) چاوی لە دەستی هەرچی و پەرچیان بێ، چ(خدمەت)ەکی پێ ئەکرێ؟ (عَلم)ی کوو (زیاد) ئەکا؟ ئەبێتە (ملا)یە، کەلەو (عصر)ە— بە(حَق)—پێی بڵێن:"(مَلا)" (إنسان)ی (کَریمُ الطّبع)، خوێن پاك، نێك گەوهەر، (مَمنون) و (مُتَشَکّر) ئەبێ لەڕێی چاکە (ماڵ صرف)ئەکا، ئەوی بەد گەوهەرو مایە پووچ و خوێن پیس بێ لە ڕووی (کِبر) و (عِناد)ەوە ﴿فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ﴾ ئەگەر (مؤمن)بێ، (یعنی) بڵێ:"خوا هەیە" (وَلَوْ مُشْرِك)بێ،

ئەگەر (دَهرِی) و (مُلْحِد)و (طَبیعیّون)بێ بەهیچ (وَجە)یێ بە دلێ و زوبانی دانایە، کەئەمە لە(طرف)خوایە . ئەو (قَوْل)ەی لە ڕووی (تَشکُر)و (تَحَدُّث) بە (نعمەت) نیە، لەڕووی (کِبر) و (إفتخار) و (إفتقار)ی خەڵك، (خاصَّةً ضُعف) و (فُقَرا)ی (أهل)ی (إیمان)، کە لە(ذِلّت) و (فَقر) و (فاقە)دان، ئەڵێ:" ئەگەر لای خوا شتێ بان، (حرمەت)ی ئەگرتن، بە(مالّ) (إکرام)ی ئەگرتن، وا(فقیر) و هەژار نەدەبوون" (فَیَقُولُ) .. إیە، (جواب)ی (لَمّا)یە، (إذا) (ظَرف)ە، بە(یَقُولُ) (مَربوط)ە، دیارە لەو (وەقت)ەدا ئەوقسە ئەکا، (أصل)ی (ترتیب)، (أمّا إنسان) ئەڵێ:"خوام (إکرام)ی گرتیمە، لە (وەخت)ی (إبتلا)ی"(یعنی) لەو(وەقت)ە ئەو (کلام)ە ئەڵێ . ئایا دروستە (تقدیم)ی (مابعد)ی (فا) لە (فا)، یان دروست نیە؟ (زمخشری) و جەماتێ لە (مُتَبحرِین)ی (نحو)، (تجوین)ی ئەدەن، (جمع)یێ (تجوین)ی نادەن، (بالّطبع) ئەو (نوع)ە (مباحِث)ی (نحوی) (أدا)ی بەزوبانی کوردی بە (نوع)یێ (أکثر)ی (ناس) تێ ی بگەن، زۆر (زەحمەت)ە، بەڵکو(مُحال)ە.

﴿وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلاَهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ﴾ (رِزق)ی بەسەر تەنگ هێنا، (فقیر)بوو، وە کەم "(أرزاق)" وەکی (کوردی) ئەڵێ، (فقیری)ش وەکی دەوڵەمەند، بۆ (إمتحان)ە لە دەوڵەمەندی (إکرام) و (إحترام) (مَلحوظ)ە، (أمّا) لە (فقیری) (إهانَهُ) (مرعی) نیە بۆیە نافەرمووێ: " وَأَهانَهُ " وە( أساساً بنی ئادەم) لای خوا (مُهان) و (ڕەزیل) نیە، ئەفەرموێ:" (وَلَقَدْ کَرَّمْنا بنی آدَمَ)" (لکن نَظر) بە (إنسان)، (فقیر) (مُحقَّر) و (مُهان) ە — (خاصَّةً) لەو (زَمان)ە . لە (أیام)ی مندالّیم بابم (بعض)ە (شعر)ی کوردی بۆ دادەنام، ئەز (جُملە) ئەی فەرموو:

ئەوی مالّی نەبێ قوربان هەنووکە

لەوی ما قووڵترە خواجە حەنووکە

ئێستا بە جارێ بەدتربووە، بەڵێ کەسێ (عِزەت)ی (نَفس)ی هەبێ، (ممکن)بێ (وِقار)ی خۆی ڕاگرێ، نەختێ بە(حُرمەت) ئەبێ ﴿فَیَقُولُ﴾

ئەوكەسە ئەڵێ:﴿رَبِّي أَهَانَنِ﴾ خوام(إهانه)ی كردیمە، (واقعاً) هەزار (كُفریات)ی لێ (صادر)ئەبێ .هەرچەند (مُحقَر) و (مُهان)بێ، (لكن) خوای (تعالی) بە (قصد)ی (إهانه) (فقیر)ی نەكردیە، (دُنیا) خۆی (دار)ی (تَجربه)یە وەك لە(سوره)ی (فلك) ئەفەرموێ:"(خَلق)ی مردن و ژینی كردیە، بۆ (إمتحان)" گەلێ جارم ووتیە:" لەو(عصر)ە (دین) داری لەگەڵ (فقیری) (ممكن)نیە، چونكی (ملایەتی) ئەمڕۆ نانی تیانیە، (عالِم) ڕووی لێ وەرئەگێڕێ،(فقێ)یە زۆر (قابل) (عمر)ی خۆی (صرف) ئەكا تا (إجازه) وەرئەگرێ، دوایە ئەبێتە گاوان، بەم (ڕەزالەت)ە كێ ئەیەوێ؟" (إلى الله المُشتكى) ﴿كَلاَّ﴾ وا مەڵێ، وانیە .

(بە دەوڵەت مەنازو بە نەكبەت مەناڵ

كی إین هەردووڕا زود باشەد زوال)

زۆرمان دیت (فقیر) دەوڵەمەندبوو، دەوڵەمەند (فقیر) بوو، گاوان بوونە شاە، شاە بوونە گاوان، (أمّا عَلى كُلِ حال) ئەبێ (إنسان) بۆ گوزەران (سعی)بكا، بە (فقیری) (مأیوس)نەبێ ﴿بَل﴾ وەك (زُمخشری) ئەفەرموێ:" لێرە خراپتر لەو (قَول)ە هەیە، ئەوە (قَول)ێ (شخص)یە (عائد)ی خۆیانە ﴿لاَّ تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ﴾ چ جایە(إكرام) (جَفا) یان ئەدەن، ماڵیان ئەخۆن ﴿وَلاَ تَحَاضُّونَ﴾ (رغبەت)ی ئێكدی نادەن ﴿عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ (فقیر)ی بێ دەسەلاتی (مُستَحقْ)، (ترغیب)ی چی؟ئێستا (مُتَرَصِدّ)ن، تووشی بێ دەسەلاتی، پیرێژنی كوندو كوڕ بن، ڕووتی كەن، مریشكی لێ بدزن، ئەوجا بنۆڕنە (آیة)و تەماشای (حاڵ)ی (بَشری)كەن، ئێستا ئەوانەی ئێمە لەو (جِهة)ە چەند (مَذموم)ترن ﴿وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ﴾ میراتی ئەخۆن ﴿أَكْلاً لَّمّاً﴾ تێكەڵاو، (حَلال) و (حرام)، پشكی خۆمانە، ئی ژنان، هەتیمی بێ كەس وبێ دەرەتان، ئەوەش هەیە، وەئەی بینین. ئەوانەی ماڵی زۆریان بە میرات بۆ ئەمێنێتەو، بە(إسراف) بە پای پیلان ئەی خۆن، پێوەی ماندی نەبووینە، بەعارەقەی نێوچەوانی پەیایان نەكردیە، زۆر دەبێ (مُفلس) و ڕووت و ڕەجال دێنەدەرێ، برادەرانی (زمان)ی (عَیش)ونۆش ڕوویان لێ وەردەگێڕن، بە قونچكە پیازێ

بەسەریان ناکەنەوە (أمّا) لە (وەقت)ی (إسراف)و بوونیان، چینکە نانەکیان لەرێی خوا نەدەدا، بە(فقیر)یێ، بە (سفاهەت) و (سَیّات) (مُبَذِر)، بە (حَسنَة) (بَخیل) و (شحیح) و قارنان ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾(شدید، قَوي) (زمخشری) ئەفەرمویێ:" بە (شِدّة)و (حِرص) (مَنع)ی (حُقوق)" (حُبّ)ی (مالّ) بە (وَجه)یێ (إیثار)ی بکەی لەسەر هەمووشت، خراپە، بۆ (دنیا) و (آخرة) (مُضِرّ)ە، (أمّا سعی)کەی (مالّ) پەیاکەی، لە (مصالح)ی (خُصوصی) و (عُمومی) (صَرف)ی کەی (حقا) مایەی (سعادەت)ە مِن (بَعض)ە (أولیا)یە دەوڵەمەندم، گەلێ خۆش ئەویێ، وابزانم (عبدالخالق)ی (غجدواني) زۆر دەوڵەمەندبووە، (حتّی) ولاّغی بەرزەیی چاك چاکی بوە، زنجیریان لەزێڕ، میێخ زنجیریان لەزێڕ، دەروێشی بۆ (إمتحان) وولاّغی زۆر (عالی) لیێ ئەخوازیێ ئەفەرمویێ:" ئەوەتە، بڕۆ بیبە " دەرویش زنجیرەکەی لەلاقی ئەکاتەوە، تەمای ئەبیێ بە جیێ ی بێڵیێ، (شێخ)ئەفەرمویێ:" جێی مەیەڵە، گوڵێ مێخی ئەو زنجیرە لەعاردی چەقیوە، لەدڵی ئێمە نەچەقیوە" یەکیێ لەو(نوع)ە (ذوات)ە، (سَنوی) (واردات)ی (مُلْل)ی، شێست، حەفتا هەزار (دینار)بوو، (أکثر)ی لەڕیێ ی خوا (صرف)ئەکرد، ئەی فەرموو:"ئەگەر سستی بکەم لە (کسابەت)، (واردات)م کەم ئەبیێ، خوا(حساب)م لەگەڵ ئەکا: بۆچی سستیت کرد؟ (سعی)ت کردبا، با(زیاد)با، زێترت لەڕیێ ی مِن(صرف)کردبا" (ألْحق) ئەمە خۆیەتی.

(حکایەت) زۆرن، (لکن) (حاجەت) بە (حکایەت)نیە، (مالّ)ی (دُنیا)، (مدار)ی (جبات)ەن (مدار)ی (إعتبار)ە مامۆستا(ملا أحمد) (ڕەحمەتی لیێ بیێ) ئەی فەرموو:" بە(عزّەت)(ترك)ی (دنیا)مان کرد، بە(ذِلّة) (طلب)ی ئەکەین" (إشارە)ی بۆ ئەو شێخانە ئەکرد بیێ کارو(کسابەت)، بۆ (جهەت)ی (معیشەت) ئەگەڕان، بە (سوالّ) و (صدقە) بەڕێوە ئەچوون . بەڵیێ (حُبّ)ی (دُنیا)سەری هەموو گوناهانە، قسەمان لە(حُب) نیە، ئارەزوو ئەکەین، بۆ(خُدّام)ی (دین)یی، (خزمەت)ی (دین)ی پیێ بکا،

یاربّی بە(ڕحیم)یّ کی هەستی
شەش چیز مەرا (مدد) فروستی
(إیمان) و (أمان) و تەندروستی
(علم) و (عمل) و (فراخ) دەستی

﴿كَلاَّ﴾ لەوە (منع)بن ﴿إِذَا دُكَّتْ الأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾ کە ئەرز شکا، پارچە پارچە بوو، بە(زلزلە)ی (آخرەت)وەکی (هبا)ی لیّ هات ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ﴾ خوای توو هات بۆ (مەیدان)ی (عرصات)، (یعنی) (جلال) و (عظمة) و (قدرەت) و (قوەّت) و (سَطْوَة)ی (ظاهر)بوو، (إستیلا)ی (عالم)ی کرد، (لازم)ە (تأویل)بۆ (مُتَشابِهات) (معنا)ی (لایەق)ی (مقبول)ی (عُقول) چاترە لە(تَوَقُّف) و (تَفویض)، (مادام) خوا (فَوق الطبیعە ت)بیّ، نابیّ (أحوال)ی وی وەکی (طبیعیّات)بیّ ﴿وَالْمَلَكُ﴾ باهاتنی وان (حقیقی)بیّ، (إنتقال) و (أشباه)ی بۆ وان هەیە، بابێن ﴿صَفًّا صَفًّا﴾ (دەورە)بدەن لە (أهل)ی (مَحشر)، یا (صف صف) ڕاوەستن، (مُنتظِر)ی (أمر)بن .

لە(آخر)ی (سورە)ی (زُمر) (بیان)کرا، کە ئەوانیش (فصل)ی (قَضا) یان، لە (بَین)یّ ئەکریّ، هەرچۆنیّ بیّ، بۆ (نجات)ی ئەوانە نایەن، کە (تَقدُّس)یان ئەکەن، وە ئەلێن:"(بناتُ الله)ن" ﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾کیّ ئەی هێنیّ؟ دیارە (مقصود)نیە، بەهەر(طرز)یّ بیّ، ئەهێندریّ، (فکر)ی ئێمە لەگەلّ (فکر)ی (أکثر)ی ڕابردوان جودایە، ئەوەی (قرآن) (إمهال)ی بکا، مەراقی (کشف) و (إظهار)ی مان نیە، وە بەچاوی (نقد) ئەنۆڕینە (روایات)، (وَلَوْ) لە (أمثال)ی (إبن عباس) و (حضرەتی علي) (نقل) کریّ، لە(روایات) ئەلێن:" ئەم(أرض)ە پان ئەکریّ (بشر) و (جن)، (عُمومی) زیندی ئەکرێنەوە، لەسەر ئەوعەردە ڕادەوەستن، لای (بعض)یّ (حیوانات)یش زیندی ئەبنەوە، (جن) (فَوق المعدل) لە (إنسان) زۆرترن (ملائکة)ی ئاسمانی(أوّل)، کە لەهەموو(إنسان) و (أجِنّ)ە گەلیّ زۆرترن، ئەکەونە سەر عاردی، (دەورە) لە (إنسان) و (أجِنّ)ە ئەدەن، (وکذا مَلَك)ی ئاسمانی دووەم و سێیەم تا حەوتەم، وە(عَرش)ی خوای ئێنن

دای دەنێنن وەلە (آثار) چی ئەڵێن:" لە(عظمـة)ی (عـرش)؟" وە(جَهـنّم)یـش دێ، (وكذا جنّة) " لازم (لازم)ە بە (خیال)ێ نەختێ (صحیح)، (دقّة) لەوقسانە بکەی(أرض) چەند هەزار هەندە گەورەیی، وەلێك بكرێتەوە، تا بە(قَدَر) توێکڵە سیری تەنك ئەبێ، جێ ی ئـەو هـەموو (کائنـات)ە ی چۆن لەسـەر ئەبێتـەوە؟ (حَق)وایە، ئەو(روایات)ە (نقل)نەكرێن، بۆ (نَشأة)ی نوێ، لای كۆنەكانی مێشك سووك، قەی ناكـا، (واجـب)ە بـەگوێرەی(أمـر)و (إرشـاد)ی (مُرشـد)ی (أعظـم) بنۆڕینە (حال)ی (سـامع)آن، بـە (قَـدَر) (عقـل) و (شُـعور)یـان قسـەیان لەگـەڵ بکەین، (لكن مع الأسف) ئەو (نوع)ە (ملا)یە زۆر كەمن، وە تادێ كەمتر ئـەبن، (ملا)ی ئەمڕۆ (لازم)ە لە (عُلوم)ی (نَقلیّ) و (عَصری) (مُتَبحـرّ)بـێ، وە (ذات)ێ (مُتفكّر) و (مُـدبّر)و بـە (سیاسـەت) و(كیاسـة) و (قُـوّە)ی (تعـبیر)ی چـاك بـێ، بتوانێ (حكیم)آنە، (مُخاَطب)تێ گەیەنێ، (ملا)یان پێ گەیـەنی، بتـوانی لەگـەڵ (مُلوك) و (عُظما) بـدوێ، لـە(مَحافـل)ی (سِیاسـة) (مُطـابق)ی (حـال) و (مَقـام) (نُطق)بدا، (قُوةّ)ی (مُقنعی)ببێ، (أمـا) زۆر دوورە، (شَـهامة)ی خـۆی ئاگـاداری بکا، وەچەند (ألسنَة)بزانی ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ئەوێ ڕۆژێ ﴿يَتَـذَكَّرُ الإِنسَـانُ﴾ (أمّـا)بـێ (وەقت)ە ﴿وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى﴾ جێ ی (دار)ی (دُنیا)بوو، لەپاش (عَیـان) (تَوبـة) و (إیمان) چ كەڵك ئەگرێ؟ ئەڵێن:" كە ئەو (آیات)ە (نازِل)بـوو پێغەمبـەر(ﷺ) زۆرتێـك چـوو، ڕووی (تَغیُـرّ)ی بەسـەراهات، ئەوانـەی لـە (خزمـەت)ی بـوون ئەو(ماڵ)ە یان لەسەرگران هات، (خبر) یان دا، (إمامی علی) (حضرەت)ی هات لە پشتەوە، دەستی لە پێغەمبەری (ﷺ) وەرێنا، لە باوشی گرت، پشت ملیـی ماچ كرد (عَرض)ی كرد:" (یانَبيَّ الله، بِأبي أنْتَ و أُمّی) ئەوڕۆ چ بوە؟ چی تۆی گۆڕی یە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەم (آیاتـە)ی بـە سـەردا خوێنـدەوە " لام وەیـە (إمام) ناتوانێ بەو (نوع)ی (رسول الله)ی لە باوش گرێ، زێڕا (إمامي علی)، زۆر شـەرمی لـە پێغەمبـەری (ﷺ) كردیـە لای (غایـەت) بـە (هەیبـەت)بـوە (حتّـی روایەت)ی لێ ئەكـەن: فەرموویـەتی:"مـن (شـكل) و (شمایـل)ی (رسـول الله)ی

(ﷺ) زۆر چاك نازانم، چونکی (قط)پڕ بەچاو نەم نۆڕیتیٚ" (حقاً)وایە، وا ئەبیٚ.

(ڕەحمەت) لە (زمخشری)، وا دیارە (دائر) بە (نقلیّات) زۆر گویٚ لە مستە، خۆش باوڕە! ﴿يَقُولُ﴾ (إنسان)، کیٚ هە (إنسان)؟ ئەوەی (مُتَردِّد)ی بیٚ (مَسلَك) و (مبدأ) و (مُضطرب) — نەبە(فقیری)، نە بە دەوڵەمەندی— نایەتە ڕای، (بَخیل)ی (مُجِبّ)ی (مال)، ئەویٚ ڕۆژیٚ ئەڵیٚ:﴿يَالَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي﴾ لە(حیات)ی (دنیا) بۆ (حیات)ی (أبدی) و (سەرمەدی) شتەکەم پیٚشین ناردبا، (سعدی)ئەڵیٚ:

بەرگی (عَیشی) بە گۆڕی خۆیش فروست

کەس نە یارەد زوپەسی توو پیٚش فروست

وا باشە شتیٚ لە پیٚشە خۆت بنیٚری، کە دوای خۆت (أثر)ی (خیٚر)ی بمیٚنیٚ، (زمخشری)ئەڵیٚ:"ئەو (آية)ە،ئەو (تَمنّا)یە، (دلیل)یٚ گەلیٚ ئاشکرایە، کە ئەوانە (إختیار) لەدەستی خۆیان دابووە، (مُتَعلّق)بوو، بە(قَصد) و (إرادەت)یان، (مَحجوب) نەبووین لە (طاعات)، (مَجبور) نەبووین، نەکراون، لەسەر(معاصی)" (إمام) و (بیضاوی) و (سیّدی آلووسی)، (جواب)ئەدەن: (آیەت) یا (تَمنّا) هەر (دَلاله ت) لە (تمکّن)ئەکا، (یعنی) (إمکان)ی بووە چاکە بکا، (قُدرەت)ی بووە، (أمّا قُدرەت)ی بیٚ (تأثیر)ە، ئەگەر خوا بۆی کردبا ئەبوو، (خُلاصة) (کَسب) ئەدەنە(عَبد)، (خَلق)ئی خوا، ئەگەر(خلق)ی (عصیان) و (کفر)ی تیا کرد،ئەبیٚ بە(عاصی) و(کافر)، گۆی یا ئیٚمە(جَبریّة)ی (مَحض)نین، زیٚرا (قُدرەت) بۆ (إنسان) پەیائەکەین، (لکن مَقدور)ەکە بە(خلق)ی خوایە، وەکی(ملا) یەکانمان ئەفەرموون:"بە (مَحض)ی (خلق)ی خوایە" (أمّا) بە (حق) نەیان توانیوە، (تحریر)ی (کسب) بە(نوع)یٚ بکەن، ببیٚتە (مَدار)ی (مُکافات) و (مُجازات). ئیٚمە (إنسان)ان ئەبینین، هیچ (إیمان)ی بە (خلق) و (إرادة)ی خوای نیە (مَحض) (طبیعة) ئەناسین بە (علم) و (قدرەت)و (إرادەت )و (إختیار)ی خۆی، (سعی) ئەکا، شەوو ڕۆژ، بیٚ ئارام،

(صبر) ئـەکا، (بعـض)یّ بسـت و پێـنج سـالّ بـوو، لـە گۆشـەیە، (عـومر)ی (صَرف)کرد، تا (آلەت)ەکی–پێـی بچنە بن (بحر)–دروست کرد، ئەوهـەموو (عجاییات)ە (إختراع)ئەکەن، لەسەر ئەو (رَأْی العَین)ە چۆن (إنکار)ی (إختیـار) و (قُدرەت) و (قوەت)ی (إنسان)ئەکریّ؟ ئێمە (ضـعیف) بـووین بـەبن کـەوتوو وین، (حاجەت) بە (مـەیدان)ی (عرصات)ناکا، بچۆرە (مـەیدان)ی (حـرب)ی (رووس) و (ئـەڵمان)، بزانـە چـی ئەکـەن؟ چ (قـُدرەت) چ(قـُوەّت)، چ(عـزم)و (جـــزم) و (إرادە)، چ(روح)دان، لــــەرێی(وطــــن) و (زعــــیم)ی خۆیــــان (صرف)ئەکەن؟! ئـەو (نـوع) و (إعتقـاد)ە، چ(فائـدە)ی دا بـە(إسلام)؟ (لازم) بوو (أهل)ی (علم)ی (روح)، (حیات) و (سعی) و (غـیرەت)و (قـوەت)و (إرادە)و (إدارە)و (صَـبر)و (ثُبـات)و (کشـف)ی (قـُوا)ی (طبیعـة)، بخەنـە(دمـاغ) و دڵـی(مسـڵمان) آن، (حقّـا إنسـان) (مظهـر)ی (صـفات)ی (إلـە)ە، لـە (علـم) و (قُدرەت)و (إرادە)و دێن وبیستن و گـوتن، (نصـیب)یّ (عظـیم)ی هەیـە. ئەگـەر (صرف)ی (علم) و (قـُدرەت) و (إرادة)بـا، بـۆ (حفـظ)ی (دیـن) و (دنیـا) چـەند باشە، کوو (قَوم)ی بەسەر ئەکەوت، بە (عَزّە ت) و (حرمەت)ئەبن. واباشـە بـیّ (میل)و (محابا)یی (سَنّی) و (إعتزالی) بە چـاوی (إعتبـار) تەماشـای (صـفحە)ی (کائنات) بکەی، وە بزانی: (قوم)ی بـیّ هێـزو بـیّ هـۆش و (إعتبـار) و (سـعی) ئەبنە (حیوانات)ی (مستخدَم) (إلهی) ئەمە چیە؟ چ(قـُدرەت) (قـُوّەت) لەسـەر (أمُور)ی (غریبە)، دوورە (عقل) بەڵکو (مُحـال)، ئەدەنـە (ملائکـە) و جنۆکـان، وە (مسلّمان)ی (مکلَّف)، (مأمور) بە (أمر)ی خوا (محروم) ئەکەن، لە (قدرەت) و (إختیـار) و (تـأثیر)ی (قـُوّە ت)ی، (حتّـی) لەسـەر (أدنـی) (عَمـل)ی مـن (رسالە)کم هەیە لە (إختیار)، زۆر بە (فائدە)یە، بێ(نَظیر)ە،(لازم) بـوو (نشـر) و (حفظ) کریّ.

﴿ فَيَوْمَئِذٍ﴾ ڕۆژی ئـەو (أحـوال) و (أقـوال)ە، ڕۆژی (تَـذکُّر)، وەك ئـەمڕۆی ئێمە، لـە (دنیـا)، (مَـع هـذا) (علـی الأکثـر) لەسـەر (إعتقـادات)ی (مزخـرف)ن، (إصلاح)ی دڵی خۆیان ناکەن، بە (إعتقادات)ی چـاك وپـاك خـاوێنی ناکەنـەوە،

ئەویٚ ڕۆژیٚ ﴿لاَ يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ وَلاَ يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ﴾ (مُجمـلاً) کـەس، وەکـی وی (عذاب) نادریٚ کەس وەکی وی بەند ناکریٚ، (جَمع)یٚ لە (قُرّاْ)ی (کِرام) ئـەو دوو (فِعل)ە، بە(بِنا–فاعِل) (یعنی) بە (کَسر)ی (زال) و (ثاء) ئەخوێننـەوە، وە لە (مصاحِف)ی (مخطوطة) و (مطبوعة) لای ئێمە وا نووسراوە، (حتّـی إمـام)ی (أقدم) (إبن جریر) ئەفەرمویٚ (غَیر)ی (کسـائي)، (إجمـاع)ی (قُـرّا)ی (أمْصـار) لەسەر ئەو (قرائەت)ەیە، وە ئەو دوو (ضَمیر)ەی هەیە: (لَعَذابَـهُ) وَ (وَثاقَـهُ) یـا (راجِع)ە بۆ خوا، یا بۆ (إنسان)ە، وە(جَمع)یٚ–وەك لە(تفسیر)ی (نەیسـابوریٚ) و (سیّدی آ لووسی) دایە بە (بِنا مَفعول)، (یَعنی) بە (فَتح)ی (ذال) و (ثاء) یـان خوندیتـەوە، یـەکیٚ لـەوان (کِسّـائي)، یـەکیٚ (أبـو عَمـرو)، (بنـا) بـە (قـول)ی (زمخشري))، (أبو عَمرو) لە (آخـر)ی (عُـومر)ی بـۆ ئـەو (قرائـة)ە گەڕایتـەو، وە (إبن جریر) ئەو (قرائەت)ە بە (صَواب) نازانی، (حَتّی) ئـەڵیٚ:" (کِسّـائي) (بِنـا) بە (خَبَر)یٚ (واهِـیُ الإسْـناد) وای (قـرائـەت) کردیـە، (معنـی)ی (آیـەت) لەسـەر (قرائەت)ی (أوّل) وە (ضمیر) بۆ خـوا، ئەمەیـە: ئـەویٚ ڕۆژیٚ (أحـد)یٚ (عـذاب) نادا، وەك (عـذاب)ی خـوا، (أحـد)یٚ بەنـد ناکـا، وەکـی بەنـدی خـوا، ئێـوی لـە هەموو کەس گرانترو (محکـم)تـرە، وای لـیٚ ئەفامرێتـەوە، ئـەوی ڕۆژیٚ ئێـدیش هەن، (عذاب)ی خەڵکی بدەن، وە(وَثاق)یان بکەن بیـان خەنـە (غـلّ) و زنجـیر، لەبەرئـەوە، (بَعـض)یٚ وەکـی (إبـن جریـر) ئەفـەرمویٚ: (إنکـار)ی (قـرائـەت)ی (کسـر)ە ئـەکا، (أمـا) (حقیقـةً) ئـەوە (وَجـە)یٚ بـیٚ (وَجـە)ە، دیـارە(مقصـد) (حصر)ی (عذاب) دانـە لـەخوا، لـە (فاتحـة) وە زانـدراوە، بـەس ئـەو (مالـك)ی ڕۆژی (جزا)یە، (تَعذیب) و (تَنعیم) (عائد)ی ئەوە، (مَع أنَّهُ مُمکِن)ە (قِسم)ی لە (سەرامەدان)ی (کُفر) و (ضَلال)–(رأساً)–بە(أمر)ی (تکوینی إلـە) لـە (طـرف) خوای (عذاب) درێـن، وە بخرێنـە، نـاوکۆت و زنجـیرو زۆلان، (قسـم)یٚ (زبانیـە) (مباشرەً) (عـذاب)دان و بەنـدکردنیان ئەکـەن، دیـارە ئێـوان وەکـی ئـی خـوای نابیٚ. وە لە (تقدیر)ی (ضمیر) بۆ (إنسـان)، لـە هـەردوو (قرائـەت) (حاصِـل)ی (مەعنا)یەکە، ئەو (إنسان)ە (عذاب)ئەدریٚ، پاوەند ئەکریٚ، بە (نـوع)یٚ، کـەس

وا (عذاب) و بەند ناکرێ یاران جای (تَعجُّب)ە بە (إتّفاق)ی (ملا)یانی (أُصولی) (قرائەت)ی (سَبْعە) (مُتَواتِر)ن کەوابێ (إبن جریر) یا کەسێتر چۆن ئەتوانن (إنکار)ی یەکێ لەو (قرائەت)ە بکەن؟ ئەگەر (مُتواترە) چۆن (إبن جریر) ئەڵێ؟:" ئەو (قرائەت)ە (بنا)ی لەسەر (خَبر)ێ (واهی الإسناد)ە" من لەبەر ئەو (نوع)ە (خلافات)ی بێ (معنا) (حظ)م لە (قرائات)ی (مختلفة) نیە، (حظ)م ئەکرد: گەلێ لە (قرائات)ی (شاذّة) (إمحا) کرابایەو.

دیارە قسەلە (عذاب)ی (إنسان)ە باسی (شیاطین) و (جن) ئەگەر (سورة) (مکیّ)بێ، باسی منافقانیش نیە، لەو (إنسان)ە (مُعَذَّب)ە (خُصوصي) کەسی (مُراد)نیە، بالە (حق) (شخص)ێ، وەکی (أمیة بن خَلَف)، یا (أُبیّة بن خَلف) (نازل)بووبێ . نازانم کێ ئەڵێ:"(مراد) (شیطان)ە؟" ئەوقسە لە(تفسیر)ی (إبن جریر) و (زمخشریّ) و (تفسیر)ی (کبیر) و (بَیضاوي) و (نەیسابوری) و (إبن کثیر) و (أبو السُّعود) دانیە، بەس لە (تفسیر)ی (سیّد)ی دایە، بێ (بَیان)ی (قائل)ی، وابزانم چونکە (إبلیس) لە هەموو کەس زێتر (مُعذَّب)ە، (لکن) ئەمە هیچ نیە، ئەوی (إنسان)بێ (راضي)نیە، بە(إبلیس) بگوترێ:"(إنسان)" ئەگەر (قائل)ێ بڵێ:" (ضَمیر) (راجع) (إبلیس)ە، بێ(سَبْق)ی (ذکر)" ئەوە (غیر)ە (مَفهوم)ە، (في الواقع) (أکثر)ی (عُلما) لە (قضایا)ی (کُلیە)ی (قرآن) بە (غلط) ئەچن، چونکی نانۆڕنە، (کُلیّەت)ی (قَضیَّة) (نَظر) بە (مَقام) ئەیان کەنە (قضایا)ی (کُلیّە)ی (مُطلَقە)، وا باشە (إنسان) ئاگاداریی، لە (مُقتضا)ی (ماڵ) و (مقام) دەرنەچێ .

(أنَّه) (جناب)ی (حَق) (ندا) ئەکات ئەوانە، ئەی (نَفس)ی (مُذَبذب)ی بێ ئارام، بە هەمووحالاتا، (راضی)، هەرۆ ناو (أهل)ی (شقاو)، بچۆرە ناو (جهنَّم)، نە (راضی)لێم، نەلێت (راضي)م، ئەوانە (أنَّه رجوع)یان بۆ لای خودا نیە، (مُقابل)ی ئەوانە، (ندا) ئەکاتە (صاحب)ی (نفوس)ی (مُطمَئنة) ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾ بە ئارام، (ساکن) بێ (إضطراب)، لە (حاڵ)ی دەوڵەمەندی (شاکر) (مُحسن)، لە (حاڵ)ی (فقیری) (صابر) بە (وقار) و (سکونەت)، تەمام

بوو نەختێ لە (نَفس)ی (أمّـارة) و (لَوّامـة) و (مُطمئنَّـة) و (راضـية) و (مرضـية) بدوێم، (لکن) دیم لێرە (مُقابـل)ی (مُطمئنَّـة)ی چـیە؟ و ە(راضـية) و (مرضـية) (صِـفة)یێ دیـە، ئـەی (نفـس)ی بـێ (کُـدورە ت) و زەنـگ ﴿إِرْجِعِـي إِلَـى رَبِّـكِ﴾ (مَبدأ)ی (وجُود) ئەوە، (مَرجِع) ئەوە، کەسێکت نیە، کێ ئەو (ندا)یـەی ئـەکا؟ کەی؟ (الآن)، (عند المـوت)، (يَـوم الحشـر)! ئەگـەر (نفـس) لەسـەر (إيمـان) و (إخلاص) (قرار)ی گرت، بە (شدائد) و (أهوال) و (مَصائب) تێك نەچوو، (حالا) ئەو (نـدا)یـەی ئـەکرێتی، چـونکی لەسـەر ئـەو (حـال)ە بـەر (قـرار)ە، (لاشـك) نـاگۆڕێ، گـەلێ جـارانم ووتیـە: " (إيمـان)ی بەڕاسـتی، ئەگـەر چـووە نـاو دڵ، (قابـل)نیـە نایەتـە دەر (یعنـی) (زوال)ی نـابێ ﴿رَاضِـيَةً﴾ لـەخوا، لـەخۆت، لەخەڵك، لە(معیشـەت) ﴿مَرْضِـيَّةً﴾ لای خـوا، خـوات لێ(راضـی)ی، (رضـا)یـی خوایی (کافی)یە، لە هەمووشتێ زێترە، وابزانم (رضـا)مەنـدی خـوای لـە(عَبـد)ی (سَهل)ە، خوا(غنی)یە، (تکلیف)ی لە (إنسـان) (بنـا)ی لەسـەر (خێـر) خـواهی (عەبد)ە، بۆ خۆی قانزاجە، نە بۆ خوا، (إنسـان) ئەناسـێ، (حـوائِج) و (قـوا) و (مَیل) و (مشاعر) ی ئەزانێ، (شرعاً مُکلَّف)ە، (طبعـاً) بـە (نـوع)یـتر (مُکلَّـف)ە گـەلێ جـار چـارەیی (غایــەت) (مُشــکل)ە، (إدارە)ی (عائلــە)ی بەهــەر دوو (شریعەت) لەسەر (لازم)ە، (حاکم) لە (فَوق)یەتی، (ماڵ)ی لێ ئەوێ، (أولاد)ی ئەوێ (شەڕ)ی بۆ بکا (رُوح)ی لـەپێناوە دانـێ، برسـیە، (أولاد)ی زاکەزاکیانـە، گرانیـە، پـارەی نیـە، قـەردارە بەسـەد تەقـەلا، ربـە ئـاردەکی پـەیا ئـەکا، (رضا)مەندی ئـەو(نـوع)ە کەسـە، لـەخوا(زەحمـەت) نیـە؟ (غایـەت) هونـەرە! ﴿فَادْخُلِي فِي عِبَادِي﴾ (داخِل)ی (زُمرة)ی خودابە، گرۆهـی (سُـعداء)، ئەوانـەی خوا (إنعام)ی لەگەڵ کردینە، لە (أنبیـا) و (صـدّیقین) و (شُـهدا) و (صـالحین)، (رُفقا)ی باش ﴿وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ خۆی ئەزانێ چ (جَنَّـەت)ێکە کـە (نسـبە ت)ی بەخۆی ئەدا، لەوێش (مُؤمِن) ڕووی هەر لەخودایە، بە (لذائـذ)ی (جَنَّـة) (غافـڵ) نابێ . هەندێ (تفسیر)ی تر هەن، (کیف)م پێ یـان نایـە، ئـەز (جُملـە) (مُـراد) بـە: (نَفـس)، (روح)ە، لـە (وەقــت)ی زینــدی بوونــەوە، (أمــر)ی ئــەکرێتی

ئەگەڕێتەوە ناو (جَسد)ی (صاحب)یێ، (أنّه) (رَبْ) (عبارەت)ە لە (جَسد)ی (إنسان)ی، ئەمە چۆن ئەگوترێ؟ کەی (إطلاق)ی (رب) بەسەر (جَسد) کراوە؟ (معَ أنه روُح) (مُربّی) (بَدَن)ە، یاخود (مُضاف)ی (مُقدَّر) ئەکەن: (في أجْسادِ عِبادي) ئەوانە بۆ (ذوات)یێ وەکی (إبن عباس) (نسبەت) ئەدەن، (إبن جریر)یش پەسندی ئەکا، ئەوەندە بەسیە (سیّدی آلووسی) لە (آخر)ی (تفسیر)ی ئەم (سورەت)ە (دُعا)یە (نَقل)ئەکا، کە (حَضرة) (رسولی أکرم) (ﷺ) فێری (بعض)ە (صَحاب)ئانی کردیە، (أنّه تفسیر)ە بۆ (نفس)ی (مطمئنةً)، ئێمەش وەکی (سیّد) ئەو (دُعا)یە ئەکەین: (اَللّهُمَّ إنّي إسْألُكَ نَفْسَ مُطْمئنَّةً تُؤْمِنُ بِلِقائِكَ وَتَرْضي بِقَضائِكَ وَتَقْنَعُ بِعَطائِكَ، آمین) وەبۆ (نفع)ی (عامّ)ی (عباد)ی خوا، لەخوا ئەخوازین:" (اَللّهُمَّ إسْقنا اَلْغَیْثَ وَلا تَجْعَلْنا مِنَ القانتین) باز (آمین یا أرْحَمَ الرحمین).[1]

(لاحقَةٌ): (قَول) وابوو، لە (أوّل)ی (سُورەت)، بەگوێرەی (بَیان)ی (عُلما)ی (هَیئة) (بَحث)ی (فَجر)بکەین، (أوّل)ی لەیادم چوو، ئێستا هاتەوە(فکر)م، ڕۆژ (مُنَورة)، (نُور)ی لە (أرض)ئەدا، (أرض) (کثیف)ە (نُور نُفوذ)ی تیاناکا، (مقابل)ی (نور)ی ڕۆژ سێبەری (أرض)ی درێژ ئەبێ، لەهەموو (جهة)یێ (مُحاط)ە بە (نُور)، لەسەر (نقطة)یە لە (فَلك)ی (زُهرە) ئەبڕێتەوە، (أُطروحە)ی سێبەر، ئەوەی لە (نُور) نزیکە، وەك سایە سبەینان، (مەیل)ەو ڕوناکە، پێی ئەڵێن:" (شِبە)ی (ظِل)" کە ڕۆژ ئاوابوو سێبەر دەرئەکەوێ، تا ڕۆژ لەژێرە، بۆ لای (دائرە)ی (نصف النّهار) بەرە ژێر بچێ (ظِل) بۆ لای (نصف النّهار)ی سەرەوە، بەرە ژۆر ئەچێ، کە ڕۆژ (١٨)ە (درجە)ی ما، بۆ (أُفق)ی (شَرقی)، ئەویش ئەوندەی ئەمێنێ، بۆ (أُفق)ی (عَربي)، لەو (وەقت)ە (ظِل) (مائل) ئەبێ، ئەوها (لازم)ە (شَکل)ی (رسم) بکرێ



[1] — تەوابوو (تفسیر)ی (سورە)ی (الفجر) (وەقت)ی (عصر) ڕۆژی دووشەموو (١٠)ی (ربیع)ی (ثاني) (١٤)ەی (نیسان)ی (رۆمی).

لە ئەو جیێ ی، لە(نُور)ی (مُحیط) لەهەمووی نیێزیکترە لە (ناظِر) (بیاض)یێ ئەبیندریێ، بۆ لای سەرەوە، وە بۆ لای خوارەوەی، تاریکی (ظِلّ)ی (أرض) ئەستوورترە، سپیایی تیا لیێڵە، نابیندریێ، ئەوەپیێی ئەڵێن:" (فجر)ی کاذِب" کە وردە وردە ڕۆژ بۆ لای سەرکەوتن هات، ڕووناکی (تَوسُّع) ئەکات، تا لە کناری (أُفق)ی (طبیعی) (تباشیر)ی (صُبح) دەرئەکەویێ ئەمەش (فجر)ی (صادِق)ە، تا ڕۆژ لە (أُفق) نیێزیکتر ئەبیێ، ڕووناکی زیێتر بڵاو ئەبیێتەو، وە (شِدّت) ئەستیێنی، تاکو ئافتابی (عالم) سەردەردەخا، جهان بەزەڕ ئەفشانی پڕ لە (نُور) و (سُرور) ئەکا. وابزانم (کشف)ی (فجر) و (شَفق) و (کسوف) و (خُسوف) لە (طرف) (أفلاطون) کرایە)، کە بە (خیالّ) و (فکر)ی (مُنوَّر)ی خۆی، (أهل)ی (عِلم)ی لەگەلیێ (خرافات) (نجات)دایە، (لَكَ الحمدُ وَلَكَ الشُكرُ) خودایە، ئەڵیێن:" (اَلشَّئُ بالشَّئِ يُذْكَرُ)" لەو (بَین)ە لە (کتیَب)یێ ناو (مُفیدُ العلوم، مُبیدُ الهُمُوم) (تألیف)ی (جمال الدین أبوبکری خوارزمی)م دیت، ئەی ووت:" (أفلاطون) (عرض)ی (حضرة)ی (موسی)ی کردیە:هەرچی ئەڵیێ ی، بڕوات پیێ ئەکەم، (إلّا) ئەوە نەبیێ، ئەڵیێی:" خوا قسەی لەگەڵیێ کردیمە" (مەلا) (لعنەت)ی لیێ ئەکا ئەمە(جَهل)یێ (عظیم)ە، بە (تأریخ) (أفلاطون) بەچەند (قرن) دوای (حضرة)ی (موسی) بە (ولد) بووە، کەسیێ (جاهِل) ئەو (نوع)ە (کتیێب)ە ببینیێ، ئەویش (سُبّ) و (لَعنة) و (نَفرین) لە (أمثال)ی (أفلاطون)ئەکا، (حقاً) ئەوە (مُوجب)ی (تأسُّف)ە .

(سُورهُ البَلد)

ئەوجا با نورەی (تفسیر)ی (سُوره البَلد)بیێ، ئەو (سورەت)ە — (بالاتّفاق)—یا (لَدی الجمهور)، (مکّیة)، (بعض)یێ ئەڵیێن:" (مَدَنیَة)، سالّی (فتح)ی (مکّة) (نازِل) بووە ." (بعض)ی ئەڵیێن:" (أوائل)ی (مکّیّة)، (باقی) (مَدَنیَة)" (عدد)ی (آیات)ی (٢٠)ە، لە (کتیێب)ی (قرائەت) دادەرئەکەویێ، بیێ

(نِزاع)ە، (سیِّد) (تصریح)ی پێ ئەکا (مُناسة)ی لەگەڵ (سورەت)ی پێشوو (ظاهِر)ە.

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾

﴿لاَ أُقْسِمُ بِهَذَا الْبَلَدِ﴾ هەرچەند(ظاهِراً نَفی)یە، (أما حَقیقةً قَسَم)ە، (مُراد) لە (بَلَد) (مَكَه)یە، بێ (نِزاع) ﴿وَأَنْتَ حِلٌّ بِهَذَا الْبَلَدِ﴾ (جُملە)یە (مُفتَرِضە)یە، لە(بَین)ی (قَسَم) و (جواب)ی وەكی (زمخشری) ئەڵێ، وە دوو (مَعنا)ی لێ ئەدەنەوە، ئەم دوو (معنا)یە (مَشهور)ن وە لە (أكثر)ی (كُتُب)ی (تفسیر) (مذكور)ن، (أوَّل)ی:توو لەوشارە (حَلال) كراوی بێ (حُرمە ت)ی، (حتّی) بە (قدر) چوێلەكەیە، (حُرمە ت)نیە، لە (شرحبیل) (نقل) ئەكەن: لە (حَرِم) (صَید)یان لا (حرام)ە، داری نابڕن، دەركردنی توو، كوشتنت بە (حَلال) ئەزانن، خەریەكی (قَتل)تن، ئەگەر (معنا)ی وابێ، (حق)وایە ئەو شارە سوێندی پێ نەخورێ: (ذات)ێ وای وا تیا (تحقیر)كرێ، (جناب)ی (حق) لەو (حین)ە دا، چۆن سوێندی پێ ئەخوا؟ دووەم: (أَنَّهُ جناب)ی (حق) ئەفەرموێ :" لە (وەقت)ی (فتح) (نازِل)بوە" (لكن) (بِنا) بە (قَول)ی (زُمخشری) و (إمام) (مكیەت)ی ئەم (سُورەت)ە (مُجمعٌ عَلَيْه)ی یە، بۆیە (زُمخشری) لەسەر (مَعنا)ی (إستقبال) (تفسیر)ی ئەكا، (یعنی) توو (فتح)ی (مكّة)ئەكەی، بۆت (مُباح)ئەكەم، (حظ)ئەكەی بكوژە، (حظ)ئەكەی (عَفو)كە .

نازانم ئەم (مَعنا)یە (مَدلول)ی ئەم (جُملە)یەیە؟ بە(مُطابَق)ی، بە (تَضَمُّن)ی بە (إلتزام)ی . (حَقیر)یش ئەڵێ:" با(حِل) بە (معنا)ی تیا بوون بێ"، "(جناب)ی (حق) ئەفەرموێ:" سوێندم بەوشارە، كەتووی تیای" (إشارە)یە، بۆ (وجە)ی (قَسم)، وە(إلا) ئەمڕۆ شایانی سوێن پێ خواردنی نیە، (حُرمەت)ی بە (حرمەت)ی تووە، ئەمڕۆ (مع الأسف) (كعبە) (بَیتُ الله)نیە، (بیتُ الأصنام)ە، هەرچەند، (بِنا) كەردەیی (خلیل الرحّمن)بوو، (لكن أعداو الرحمن) كردیانە بوتكەدە، بۆیە (حالاً)نەكراوە، بە(قِبلە)ی نوێژ .

(إبن جرير) هەر ئەو (معنا)ی (پانی) (ذکر)ئەکا و(شێخی عربی)ش، (حل) بە (مُطلَق) (تأویل)ئەکا، (یعنی) (قَید)ت لەسەر هەڵ گیراو ﴿وَوَالِدٍ﴾ (عام) یا (إبراهیم) ﴿وَمَا وَلَدَ﴾ (عام) یا (إسماعیل) و (سائر)ی (أولاد)ی، (آدەم) هەرچەند (أبو البشر)ە (لکن) لەبەر (بنا)ی (بَیت) و ئاوەدان کردنی (مکّە)، (إبراهیم) و (إسماعیل) (أنسب)ن، وە بۆ (قریش) و (رسول)ی (قریش)ی (أنسب)ن، (یعنی) (نسل)ی (إبراهیم) (إسماعیل)، (جیران)ی (بَیت الحرام)، چۆن ئەبێ وابن؟ وابزانم (ذهن) بۆ (جناب)ی (رسول)(ﷺ) و (أمّة)ی ناڕوا، با(أبو المؤمنین)بێ وە (أزواج)ی داکی (مؤمن) ئان بن . (عجایب)ە لە (إبن عباس) (نقل)کراوە: (والد)ئی (صاحب وَلد)، (وَماولَد)، (عاقر)، (عَقیم)، (ما) (نافیە)یە .ئەبێ (موصول)ەکی بۆ (مقَدَّر)کرێ، ئەمە بۆ؟ سوێند بە (عاقر)، چ(مناسبە)ی هەیە؟ وە(بالعکس) لە (عکرمە) (نقل)کراوە:(والد: عاقر)، (وَماَوَلَدَ): ئەوی (وَلد)ی ئەبێ، (ما) بە (مَعنی اَلّذی)یە (مع الأسف) (تلاعب)ی (نَقل)ەیە.

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ﴾ (قسم)ی (معهود)، یا (جنس)، (أمّا صدق)ی لە (بَعض)ی دێ ﴿فِي كَبَدٍ﴾ لە (فَساد) و (غلظ)ی دڵ، ئەوانە بەد(طینة)ن، (إرثاً) (خراپ)ن، خۆیان ناناسن، وا ئەزانن (فَوق الکُل)ن لە(وەقت)ی (قوەت) و (مُکْنَت)ی وە (ظُلم) و (فَتك)ی، وائەزانی کەس دەرووەستی نایە ﴿أَيَحْسَبُ أَنْ لَنْ يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ﴾ زۆری وا هەن، لە (غِلظة)ی دڵەوە، وا (حساب) ئەکەن، کەس ناتوانی بەرابەریان بکا، ناتوانێ (إنتقام)ی لێ بکاتەوە، (مُمکن)ە لای (محاڵ)بێ، (ناپلیۆن) ئەی ووت:" ئەگەر ئاسمان بەسەر ئەرزدا بکەوێ، بەسونگی (عەسکەر) بڵندی ئەکەمەوە!" ئەو(حَماقة)ە، ئەو (وَقاحة)ە، لە (جَهلە)ی (طرایق) زۆر دەرئەکەوێ، لەو(عصر)ە (إدعا)ی ئەو (جَهلَة)، لە (إدعا)ی ئەو (کافر) ئانە تێ پەڕیوە، بەڵکو(اَلعِیاذ بِاللّه)—لە (مقام)ی (أُلوهیّت)یشی (تجاوز)کردیە زۆری وا هەن، کە یەك دوو نەردیان بۆ هات،

لووتیان ئەچێتە ئاسمان، ئیتر (قط) (مغلوب)نابن، وەئەو (نوع)ە کەسانە زۆر بەفیشاڵن، با (وجود)ی کتکی (أباهُریره)ی نمەکی ناکا.

﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالاً لُبَدًا﴾ (ماڵ)یّ زۆرم (صرف)کردیە، (قسم)ی لەوانە کەمیّ (عاقل)ن، لای (أجانب) ئەوانەی شارەزایان نەبن، ئەم لاف و گەزافە لیّ ئەدا، (قسم)یّ کەرو بیّ(مبالات)ە، یاخود بیّ شەرم و (حیا)یە، لای ئاگادارانیش ئەو فیشالانە ئەکات، ﴿أَيَحْسَبُ أَنْ لَنْ يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ؟﴾ کەس نەی دیوە؟نای ناسن؟ دیارە (أحد) (نَکِرَ)ەیە، لە (سِیاق)ی (نَفي)یە، (عامّ)ە، یا(عامّ)ی (نسبی)بیّ، (ذهن) بۆ (واحد)ی (أقدس)ناچیّ، (أقلّ)ی (مراتِب) خۆی تەماشاکا ﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ﴾ ئەڵیّ ی ئەو کەسەیە، بیّ چاوە، هیچ نابینیّ، بەڵیّ (إنسان)ی بیّ چاوو ڕوو، ئەوی بیلّیّ، ئەیلّیّ ﴿وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ باریّ هیچ نەبا، بەو دوو لێوە، زوبانی خۆی گرتبا، (أنَّهُ) زوبانی بەڕەڵایە بۆیە نای گێڕێتەوە. (سعدی)ئەڵیّ:

زوبان دەردهان چیست، ئەی نامور؟

کلیلی دری کەنجی(صاحب)هونەر

(حتّی)ئی بیّ هونەر، ئەگەر تۆزیّ هۆشی هەبیّ، ئەی بەستیّ، (مَقصد) ئەگەر کەسیّ دووچاوی و زوبانی و دوولێوی هەبیّ، ئەو (نوع)ە لاف و گەزافە لیّ نادا، ئەوەندە(حَماقة) و (جَهالة) نانوێنی ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ ڕێگای (خێر) و (شەڕ) بۆمان (واضِح) کردیە، بە (سَمع) بە (عَقل)، (واقعاً) ڕیّ ی (خێر) و (شەڕ) دیارە، وەك لە (حکایە)تان ئەڵیّ:"لەسەر دوو ڕێیانەکی بە (أحمد)یان ووت:" ئەوە ڕێی هاتە، ئەوە ڕێی نەهاتە " (إنسان) ڕێی هات و نەهات لێك ئەکاتەوە، (مَع الأسف) (أكثر) بەڕێی نەهاتدا دەڕوا، (نجات)ی نابیّ ئەگەر لیّ گەڕیین، (بەهانە) بۆ (إنسان)نیە، خودا بە (أنواع)ی (هِدایة) ڕێی نیشان دایە، وە(إختیار)ی دایتە (عەبد)، (جَبر) و مەبر نیە . (إبن جریر) (نقل) لە (إبن عباس)ئەکا: (نَجدَین): دوو مەمکە کەرێی شیرن)، (نظر) بە دوو لێو، لام شیرینە، گەرچی (إبن جریر) پێی (راضي)نیە . (هدایەت)ی (حیوانات)ی لەو

(جهـەت)ە (عجایـب)تـرە، لـەدەرەوە، وولاّغ ئـەزێ، فەرخۆڵـەی بەسـەر پـێ ئەکەوێ دەم دەگێڕی، لـەبن زگـی، لـەبن ڕانـی، مـەمك ئەدۆزیتـەوە .ئـەڵێن:" (عەرەب) سوێند بە دوو مەمکی داکیان دەخۆن" وە ئەڵێن:"(وَنَجْدَیْها ما قُلْتَ هذا ).. (مثلاً)" وائەگەیەنێ ئەوانە (حال)یان لە (زمان)ی شیرە خۆرەیی باشتر بووە، لە (حال)ی ئیستایان، ئێستا بەجارێ گومڕاە بووین.

﴿فَلاَ اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ﴾ خـۆی نەخستبێتە نـاو (أُمـوُر) و (کـاری) (شـدید) و گەورەو گران و (صَعب)، (أصلاً) بەڕێی ناخۆش ئەڵێن، وەکی چیای(چنارۆك)ی ئێمە. ئەگەر ڕاستی ئەکرد، ئەکەوتە ناو ئەو (أُمور)ە گرانەو ناخۆشـە، ئـەویش چیە؟ (حَقاً نَظر) بە (إنسان)ێ (أدنی مُرُوَّة)ی هەبێ، هیچ گران نیە.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ﴾ (أنّه) (تَعظیم)ی (عَقَبَة)ئـەکا ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ (بَیـان) و (تفسـیر)ە، (عەبـد) ئـازادکردن، ئەوەنـدە کـارێ گـران نیـە (أمّـا) لای ئەوانـە (شَدیدَ)، ناتوانێ بی کا، نازانم بۆ (أوائـل) (تفسـیر)ی (عقبـە)یـان بـە (أُمـور)ێ دوورە (فَهم) کردیتەوە؟ (جَبل)ی (زُلال) لە (جهنّم)، (جَبـل)ی (زلال)چـیە؟ یـا (نار)، (بَین)ی (جنَّـت) و (نار)، یا(صِراط) بەو (نوع)ەی کە (مشهور)ە، بەشـیر تیژترە، لەموو باریك ترە، چەند هەزار سـاڵ ڕێ یـە، ئـەوجا وەرە گـا جـووت و حوشـتری قوربـانی، بەسـەریا تێپـەڕێ! ئەوانـەی (مُخاطَـب)بـووین، ئـەو (معنا)یەیان لەو (وەقت)ی زانیە؟

(سـیِّد) خـۆی بـە (تأویـل)ئـان مانـدی ئـەکا، خـۆڕایی، بـەس (رعایـەت)ی (صاحب)ی (أقوال)ە، (شُکر) هیچـی لـە (رسـول الله)(ﷺ) (روایـەت)نـەکراوە. (أحادیـث)ی (شـریف)لـە (حـق) (عبـد) ئـازادکردن زۆرن، (واقفاً) (إسـارەت)ی إنسان) (مَعناً) بێ (مَعنی)یە (مع أنَّه) گەلێ کەس، هەرچەند (حُرّ)ن، (خَط)یـان لە (عُبودیەت) پترە، بەلاش خۆیان ئەکەنە (عَبد) بەنـدەیی ئـەم و ئـەو، توخـوا کەسێ (سَجد)ە بۆ گۆلك ببا، (حُق)نیە، وەکی گای گێرەی پێبکەی!

لە (أوائل)ی (تحصیل)م مامۆستایەکم هـەبوو، خـەڵکی لای (سـابلاّخ) نـاوی (ملا أحمد أرشد) بوو، گەلێ جار هەناسەی هەڵ ئەکێشا:" خۆزی ئێستا لە دێ

ی (بُرهان) به پشتی بەردم، بۆ(خانقا)ی (شێخ شمس الدین)کێشابایەوە" پاش (إجازه)چۆوه (بُرهان) وام زاناند، لەژێر کێشانەوەی بەردان، مرد، ئەمە گوێی یا، بۆ ئازادەگی (قیامەت)ە، بزانن (مَیل)ی (عُبودیەت) چی ئەکا؟ (حقاً) (شریعەت)(حقّ)یەتی (قَبول)ی کردیه . گەرچی (جناب)ی (رسالەت پەناه) زۆر (ترغیب) و (تَشویق)ی کردیە، بۆ (عَبد) ئازادکردن . ئەوانەی (طعن) لە (دین)ی (إسلام) ئەدەن، ئەوانەن که (سَعی)ئەکەن، (عُموم)ی (أحرار)ی (عالَم) ببنه (عبد)یان، ﴿أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ﴾ ڕۆژی برسیایەتی، وەك ئێستا (رزق) کەم و گران، بیٚ بارانی، بەپیك برە، (سبحان الله) بە (أَوْ) ئەفەرموێ (إشاره)یە زۆر (عَجیب)ە، (أنّه) هەردووکی لێ (نضوّر)ناکریٚ، (إطعام)لای پیاوی (سَخی) (سَهل)ە، وەزۆری لاخوشە،(أمّا) بۆ خودا، (إطعام) لای گەلیٚ کەس زۆر (زەحمەت)ە، ئەگەر (سابِقه)یەکی (دُنیا) و (هوا)ی تیانەبێ (زەحمەت)بیکا دەڵێن:" (مُدّه)یه هەموو ڕۆژ، سبەینان دەهەزار، ئێواران دە هەزار، لەسەر (سفره)و شێلانی (حجاج) خڕ ئەبوونەوە، (غیر)ی (تَعلقات)ی خۆی " نازانم ڕاستە، یان نا؟ (لكن صاحب) نان و خوان، بۆ ئایندەو ڕەوەندە زۆر بووین (سَغب): (لوغةً) برسیایەتیه، یا لەگەڵ ماندیەتی، (نعوذُ بالله) ئەمە زۆر ناخۆشه (إطعام)ی کێ؟﴿يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ﴾ هەتیوێ بەخزمایەتی، (خێر) بەخزمی (فقیر) دوو (خێر)ە، (صِلَه)یە، وە (صَدَقه)یە.

﴿أَوْ مِسْكِينًا﴾ (مسکین) و (فقیر) لەگەلیٚ (مَقام)یەکن، لە (باب)ی (زکات) (فرق)یان ئەکەن، وابزانم لە (شافعی) (منقول)ە:(إذا إِجْتَمَعا، إِفتَرَقا، وَ إذا إِفتَرَقا إِجْتَمَعا): ئەگەر هەر دووك (ذكر)كرێن، جوایەزن، ئەگەر تەنها (ذكر) کرێن، یەکن . وە(مسکین) به (إنسان)ی بیٚ دەسەلاٚت ئەڵێن، (وَلَوْ) دەوڵەمەند بیٚ، بۆیە ئەفەرموێ:﴿ذَا مَتْرَبَةٍ﴾ (أنّه) بەخۆڵیەوە نووسایە، خۆڵاوی بیٚ، (مأوی) و (مسكن)ی . (نَحوی) ئەڵێن:" ئەگەر (لا) (داخل)ی سەر (فعل)ی (ماضی)بیٚ، ئەبیٚ (تکرار)کریٚ، وەکی: (لاصدَّقَ) (وَلاصَلّی) (حَقَّ الإنصاف) (آية) لەو (قبیله) نیه، (آية نفي فِعل)ی ئەکا، (شامل) و (صاحب أقسام) وە

(تفسیر)ی (أقسام)ی ئەکا، وابزانم چ(تأویل)ی پێ ناوێ، ئەگەر لە (کلام)ی (عربی) وێنەی (ئایەت) یان هێنا، وە (لا) (مُکرَّر)بوو، من (تفسیر)ی خۆم ئەسووتێنم، (تأویل) و (تَفصیل)ت ئەوێ بنۆڕە (تَفسیر)ی (إبن جریر) و (زمخشری) و (سَیّدی آلووسی)، خوا (خێر)یان بنووسی، ﴿ثُمَّ كَانَ مِنْ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ (إیمان فَوق الْكُلّ)ە (أساس)ە، لای وان، لەهەمووی گرانترە، (خاصَّةً) لەگەڵ ئەوانی دوایە﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ لەسەر (طاعات)، لەسەر بەڵا، لەسەر (تَرك)ی (مَعاصی)، ئەگەر (فَقیر) بوو، نەڵێ:" خوا (إهانە)م ئەکا، کەسیدی نابینی، ئەمن ئەبینی" ﴿وَتَوَاصَوْا﴾ ئەم لەئەو، ئەو لە ئەم ﴿بِالْمَرْحَمَةِ﴾ (خاصَّةً) لە (وەقت)ی (نوازِل)، بە (مال) (تکبُّر)نەکەن، (بَخیل)نەبن، خۆیان (مَرحە ت)بن، (وَصیّة)کەن بە ﴿أُوْلَئِكَ﴾ ئەوانەی وابن، گەردەنی (إنسان)ئان لەبن (نیر)ی (أسارەت) دەهێننەدەر، (مادام) لە (وَقت)ی (حاجەت) (إطعام)ی (فَقَرا) و (مساکین)ئان بدەن،خزم و بێگانەو (أهل)ی وڵات و (غریب)، هاو(مَذهَب) با (مَذهَب) جودا، ئەوانەی (مَذاهب) و (طَرائق) و (إنتساب)، (حتّی) (تقسیم)ی (مَحلّات) بێ(ڕەحمی)یان خستە ناو (مسلْمان)آن، ﴿أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾ (صاحب)ی (برەکەت)ن، لە (آثار) (وارِد)ە: (ماڵ) لای (سَخی)بێ، یەکێکە لەدوو هەرزانیان، ئەگەر لای (بَخیل)بێ، یەکێکە لە دووگرانی یان .
وەلە (حَدیث) ئەفەرموێ:" ئەگەر چاك و پەسندەکان گەورەتانبن، (أغنیا)تان (سخی)بن، ئیشتان، کارتان بە (تدبیر) و (رَأی)بێ، سەرعەرد لەبن عەرد، بۆ ئێوە چاترە، ئەگەر (بالعکس) نا پەسندەکان بینە گەورە، وەکی ئێستا، دەوڵەمەندەکان (ثقیل)بن، کارتان بەقسەی ژنان بێ، ناو عەردی چاترە، بۆ ئێوە لەسەر عەردی" (حقاً)وایە، (لاشك) ژینی(أُمّة) بە پیاوی (أصل)و دەوڵەمەندی (سَخی)و (إتّفاق)و (مَشورە ت)ە، (بالعکس) مردنە ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا﴾ لەهەموو (سیّئات)ێ تیایە، بێ (صبری)، (تکبُّر)، قارِنانی، بێ (مرحمەت)، دیارە ئەوەی (إیمان)ی ڕاستی هەبێ بە (آیات)ی (حَق) بە گوێرەی (آیات) ڕەفتار ئەکا، ئەوەی (إیمان)ی پێ نەبێ، (مُعاکَسە)ئەکا﴿هُمْ﴾

بکا، بە (تَرك)ی (عادات) و (عَنعنات) و (أدیان)ی (آبا) و (أجداد)یان، (حُکم) بە (سعادەت)و (حماقەت)ی (أسلاف)یان بکا ئەو (عالَم)ەش ئەوەندی لەدەستیان بێ، لە(مُخالفە) و (عداوەت) و (عَذاب) دانی یە ڕەنجیدەو دلّ ئازور دەگی، (قصور)نەکەن، وە (دوام)بکا، لەسەر ئەو (حالّەت)ە، تا (وظیفە) بەجێ ئەهێنێ، (حقاً) لە (خَیال)ی (دەماغ)ی ئێمە، هوورەی لێوە دێ، ئەمە چۆن؟ کوو؟ کێ (تَحمّل)ی ئەو (مشقّەت)ە وە ئەو هەموودەردو (بەلاّ) و ڕەنجە ئەکا؟ ئەو (نوع)ە (ذوات)ە دلّیان (فراح) ئەبێ، بال قوولێ، بە (صَبر) و (تحمّل) و تەوانایی، لە (أشّد) و (أصعب)ی (أوقات) (مأیوس)نابێ، زێدە (وثوق)ی بە (نیل)ی (مُرام) پەیدا ئەبێ، دلّ (راحەت)، بێ (جَزَع)، ئەگەر (جناب)ی (رسالەت) پەناه، ئەو (طرز)ە (إنشراح)ەی نەبا، (قط، قط) ئەو کارە گرانەی پێ نەدەکرا: ئەو (شَرح)ی (صَدر)ە، شتێ نیە بە (قَلَم)، (شرح) و (بَیان) و (إیضاح)بکرێ، کەسێ (زعیم)نەبێ، نەکەوتبێتە ناو (وقایع)ی (مُدهش)ی بە (هَول)، نازانی ئەو (شرح)ە چیە؟ وە (إنسان) نازانی و (إنبساط) و (وُثوق) و بڕوایی و (إعتماد)ە کوو پەیا ئەبێ؟ دیارە (أمر)ێکە، لە (طرف) (فاطِر)ە،لەپاش (وفات)ی (رسول)ی (أکرم) (ﷺ) (مسلّمان)آن زۆر (مُتفَرّق) بوون، نێزیك بوو– (أَلعیاذُ بِالله)– (دین)ی (إسلام) (محو)بێتەوە، (أبوبکر) بە چ (روح)ێ، بە چ (صدر)ێ (واسع)، (قَلب)ێ فراوان و بە (طمأنینة)، چووە پێش ئەو (طوفان)ی (فِتنە) و (مُصیبەت)ە، چۆن (أجزا)ی (مُتفرِقە)ی (إسلام)ی (جُن) و بەندو شیرازە کرد؟!

(ناپلیۆن) بە (وُثوق) و (سِعَت)ی (قلب) و (جسارەت) و (إعتماد)ی (علی النفس)، لە (جسر)ی سەر (نهر)ی (ئەداو) تێ پەڕی، (مبالات)ی بە ئاگری لەشکری(نحسە)ی نەکرد پەڕیەوە، تارو ماری کردن، (حتّی ضابط)ێ بە (ناپلیون)ی ووت:" (مُحال) (مُستحیلە) بەو (حال)ە لەسەر ئەو(جسر)ە تەسکە(عبور)بکەین –بە (إستفهام)ی (إنکاری)– (مُحال) و (مُستحیل)ە، ناپلیۆن وتی: ئەو (کلمە) (فەرەنسی)نیە" (أنّە) (ناپلیون) (نظر) بە (بالەت) و

جورئەتی فەرەنسە هیچی بە (محالٓ) نەدەزانی، گۆڕهەڵتەکێنە (ناپلیۆن)، بنۆڕەفەرەنسە چی بەسەر هات؟ کوو شکا ؟ کوو پامالٓ بوو؟

(شرط) ئەوەیە (صاحب)ی ئەو (روح)ە ئەو دلٓ و جەرگە بە (ظفر) (مغرور) نەبیٚ، (زمام)ی عقل و (تدبیر) لە دەست نەدات، وەکی (ناپلیۆن) سبب بە غروری ئاخری ڕەنجەڕۆ دەرچوو وابزانن کە موراد لەو شەرحەی (صدر)ە ئەو شەرحەیە، شەرحی ڕووحی مەعنەوی.

وە(بعض)یٚ موفسیر حەملیان کردیتە سەر شرح ی (حسي) أولا، بە منداڵی لەلایی دایانی (حليمة السعدية)مەلائکەت هاتن سینگیان شەق کردییە .

(بعض) یٚ مواد (غلیظه) یان لە دڵی فڕێدایە، وە چەند جاریٚ دی (شرح) ی (صدر) یان کردییە، ئیمان و (رأفت) و ڕەحمەتیان هاویشتیتە (قلب)ی موبارەکی .

ئەمە با وابیٚ بیٚ (تأويل) قبولی ئەکەین، بەلاّم بڕوا ناکەم، لصرە ئەوە موراد بێت،ئەو دلتەنگی ئێرە شتیٚ ترە، وە شرحیٚ ترە، وە ئەو شەرحە (حسّي) یە، باز بۆ شرحی معنوی یە. ئێمە لە بیٚ عەقلی و (بساطة)و صافی ضمیر ئەو جۆرە قسانە قبولٓ ناکەین سەبەبیٚ هەیە، إنسان ی مجبور ئەکا بە قبولٓ ی ئەو نوع ە (أحكام) ە .

بابم فەرموی :" کە سەیدا ی "مجذوب" هاتە کۆیە لەبەر پەنجەرەی لای (شرق)ی مزگەوت، جێیمان بۆ چاکرد، کەهات نەیتوانی لەویٚ دانیشیٚ، فەرموو: "(ذوات)ی زۆر گەورە لێرە دانیشتینە، ئەمن ناتوانم لە جێی وان ڕۆنیشم" فەرمووی: "دوایە هاتە بەرچاوم، بە(عَیانی)، دلّی هێنامە دەریٚ، بە(قَلم) برەکی (بَعض)ە زەرنوقە زەڕنووقەی وەکی ژەنگی لیٚ ئەکردەوە، تا خاوێن بۆوە، دوایە بە (قلم)یٚ (واضح) بە (مداد)ی (نُوری)ن (کلمە)ی (ألله)ی لە (دەور)ی دلّم نووسی، دلّی لە جێی خۆی دانامەوە" بابم فەرمووی:" لە (مەکّکە) کە بابم هاتە (روح)دان، من ئەگریام" فەرمووی:" (عبدالله) مەگری مەگری، ئەو (کلمە)ی (ألله) کە (سەیدا)ی (مجذوب) لە (دەورە)ی دلّمی

نووسيه، هەرماوە، نەكوژايەوە" ئەجا (إنسان) بەكەسێ وەكی (حاجی مـلا عبدالله) و (حاجی ملا أسعد)ی (جليزادە)، بڕوا نەكا، بەكێ بڕوا ئەكا؟

خوا ئەفەرموێ:" (شرح)ی (صدر)تمان بۆ كردی" ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ﴾ (يعنی) (إزالە)ی كرد، لەسەری لادا، فڕێ ی دا ﴿وِزْرَكَ﴾ گرانی، ئی چی؟ ئی (نُبُوَّەت) و(تَبليغ) و (دەعوەت)ی (أنام) ﴿الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ كرتەی لەپشتت ئێنا، (أمّا تفسیر)ی (وِزر) بەگوناە (لاشك) بەگوناە (حساب)ە، نا(شكر)ی نەبێ (حضرەتی محمّد) (ﷺ) پەژارەی گوناهی نەبوو، ئەگەر ڕاست ئەكەن، ئەو (شَرح)ی (صَدر)ی بوو بوو بە منداڵی، بە دە ساڵی، بەبیست ساڵی، لەسەر ئەو (حاڵ)ەش لە گوناهان نەگەڕاوە؟ پەك قسەیە نا(مَعقول)! ئەو گوناهی ئەو (وەقت)ی هەبوو، هیچی لە(محمّد) (ﷺ) نەدەوەشاوە (مناسبە)ی نەبوو، بۆ ئەو (نَوع)ە (إنسان)ە، جێی گوناهو موناە نیە ئەو (نَوع)ە (ذات)ە، كە (مُزاولە) ئیشی گرانی كرد، (صَبر)ی گرت، (ثابِت قَدم)، (نُشَرِحُ الصَّدر) بێ (لُجوجی)، (عَجولی) (دَوام)ی بوو، بە جارو دووجارو سێ جار، (فَشل)و سستی نەبوو، (يَأس)ی نەهاتەسەر، كاری زۆر گرانی لا سووك وئاسان ئەبێ، ئەو (حُكما) يانی (مُخترع) (إختراع)ئەكەن، (تَحمّل)ی (أنواع)ی (مشقّەت)و (طاقە) فەرسا ئەكەن، تا بە (مقصد) ئەگەن، ئيوایان بووە، بيست و چار ساڵ خەريك بووە، (لَيل) و (نَهار)، تا (آلەت)ەكی (إختراع)كرديە، لەناويدا پێ بچنەبن (بحر)ێ (آديسۆن) بەچەند (تَعب) و ڕەنج و (سَعی) و (عُومر) و (ماڵ صَرف)كردن، تا (مصباح)ی (كهربائی) دروست كرد، ڕێكی خست، (ثَروەت فنون) (صُورەت)ی كێشابوو، لەسەر كورسی دانيشتبوو، ئانيشكی لەسەر مێزێ، سەری لە (بَين)ی دوو دەستی خۆی گرتبوو، (موتالا)ی (كتێب)ی ئەكرد، نووسيبوويان: (ئاديسۆن) پێنج شەوو پێنج ڕۆژ، بەو تەرزە، بێ خەو و خواردنەوە، (مُستَغْرِق)ێ (موتالا)ی (مَسئلە)يەكی بوو (حتّی) لەوە(مُدَّە) نەجولايەوە) ئێمە ئەگەر چارەگەكی تەماشای (كتێب)ەكی بكەين، نەزيكە كاريتەی پشتمان بشكێ.

گەلیٚ جار (خَیالٚ)م لەتوندومەندی (جَناب)ی (رسالەت پەناه) ئەکرد، ئەم ووت:"(قابل)بوو، پێغەمبەر (ﷺ) تا سەد سالی بە (کمال)ی (عافیەت) بژیە" (لکن صدمات)ی (وَحی) وە (مَتاعِب) و (مَشاقّ)ی (رسالەت) (مانع)بوو، ئەگەر بەو (نوع)ە بە (قَوەت)نەبا، ئەوەندەشی (تحمّل)نەدەکرد، (مُحقّق)بزانن ئەگەر (حضرەتی محمّد)ی(ﷺ) (قَبْلَ النُّبُوَّت) شتیٚ نا (مُناسب)ی لیٚ (صادر)بووبا، وەکی وەلآشەکانی خۆی، لە (وَەقت)ی (تَبلیغ) و (رِسالەت)، هەزار جاری بە چاویان دادە داوە، دە برۆ برۆ، هەتا ئیٚستا چیت ئەکرد؟ ئیٚستا چی دەلیٚی؟ ئەمن بە مندالی گەلی ئیش، برادەرەکانم ئەیان کرد، ئەمن نەم دەکرد، (خیالٚ)م ئەکرد، ئەمرۆ ئەو (نوع)ە ئیشە بکەم، کەبوومە (مەلا) لەسەر (منبَر) لەسەر (کورسی) (وَعظ) چ بلێم؟ چم پیٚ ئەلٚێن؟ لا هەلٚپچکرایە وەکی من ئەو (طرح)ە (خیالٚ)ە بکا، ئیٚوە کو (محمّد) (ﷺ) کە بۆ (هدایەت) و (إصلاح)ی (بشری) داندراوە ئەبیٚ چۆن بیٚ؟

لەو چەند سالآنە، ئیٚوارەیە لەسەر بانی (حوض)ی مزگەوتی دانیشتبووم، (بعض)ە مندالٚ چوونە ناو باغچەی لەبەر مزگەوت، کوولەکەو موولەکە بکەن مندالیٚ خەپەلۆلە لاقی هەلگرت بۆ ناو باغچە، دەر(حالٚ) گەڕایەوە، ووتی:"بە خوای ناچم، کودووی نادزم، ئەورۆ دزی بکەم، سبەی شتیٚ خراپتریش ئەکەم" ووتم:"دەك رۆلە (عَومر)ت درێژبیٚ، خوا بەر خوردارت کا" لای ئیٚمە (رُسُل)ی (عظام) لەگوناە، لە (أمور)ی ناشایستە (مُبَرّا)ن، لەمندالی، تا (آخر)ی (عُومر). لە (زەمان)ی (رسالەت) گوناە لەوان، بە (مُحال)ی (قَطعی) (حِساب)ە، کەسیٚ بلیٚ:" من (رسول)ی خودام، خودا (وَحی)م بۆ دەنێریٚ": بە(آیات)ی (خارِقَة) (إثبات)ی (رسالەت)ی بکا، چۆن (خیالٚ) ئەکریٚ، (مُخالفە)ی ئەوخوایە بکا؟ (وَلَوْ) لە (أدنی) شتیٚ بیٚ.

(مُعَظَّم)ی (عُلما)ی (إسلام) لایان وەیە، (أنبیا) (مَعصوم)ن، لە (کَبائر)، لە (صَغائر)ی (خِسَّە)، لە (ترك)ی (مُروەت) وە (إصرار) لەسەر (صَغائر) لایان (کَبیرە)یە لە (عِلم)ی (کلام)، (کلام)یٚ زۆریان (إیراد) فەرمووە، باپیرە گەورەم

(جَدَ)ی (أعلی)م(عبدالرحمن جەلی) لەسەر (مِنْحَ اَلْمکیّە)ی (شێخ إبن الحجر)ی (مکّی)، (حاشیە)یە دوورو درێژی هەیە، بە(رسالەت) (حساب)ە، (دلیل)ە (مُوافِق) و (مُخالف) و (جَواب) و (قَدح) و (دَفع)ی زۆر جوانی (إیرادا) کردینە، (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، (لکن مع الأسف) (عِلم)ی (آل)ی (جَلی) بە (ضایع) چوو.

لەهەموو کەس خراپتر بۆ (إسنادی (أموُر)ی (قَبیحە)، بۆ لای (رُسُل)آن، (ملا)ی جوولەکەکانن ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ بە (رِسالەت) و (نُبوّەت) و (نَباهەت) و (نَزاهەت) , (نَزاکەت) و (طهارة)ی (نفس)، لەنوێژان (شهادەت) لەسەر (رسالەت)ی تۆ ئەدەن، ئەمە هەمووی وایە جێی (إنکار)نیە. ئەڵێن:" (هۆلاکۆ) ڕۆژێ (وەقت)ی نوێژ (مُؤَذِّن) بانگی ئەدا (سؤال)ی لەهەم نشینانی بارەگاهی کرد:"کێ پادشایە؟ کێ گەورەیە؟" ووتیان:" (جناب)ی (عالی)، (مَلِك) المُلوك)ی" ووتی:" نظ، .. ئەو (ذات)ە گەورەیە، کە (قریب)ی شەش سەدساڵە بەو تەرزە، لەسەر(منار)آن ناوی دەهێنن" (یَعنی حضرەتی محمَّد) (ﷺ)، (حضرەتی محمّد) (ﷺ) لە (نَظر) (مُلحد)ەکانی (عَربی)ش (ذات)ێ (ممتان)ە، (مُنقطِعُ النَّظیر)ە، (بعض)ێ بە (عَطل)ی (رُسُل) (تعبیر)ی لێ ئەدەنەوە، زۆرم پێ خۆشە، (حقیقە) لە (مَیدان)ی (جَلادەت)، لە (عرصە)یی (حَرب) و (ضَرب)، لە (ساحە)ی (رسالەت)یەکە، تازە پەهلەوانێکە، کەی ناتوانێ (مُبارزە)ی لەگەڵبکا.

ئەمن دووقسەتان (عرض)ئەکەم: (أولاً) لەوێ ڕۆژی (بعثة)ی بووە، تا ئەمڕۆ بەد گۆیی لە (ثَنا) خوانی زێتر بووە، (خصوصی) (قسّیس) و (رَهبان)آنی (ئاوروپایی) ئەوەی لە (حَق) (حضرەتی محمّد) (ﷺ) و (أتباع) و (دین)ی ئەڵێن، وەخستیانە (دەماغ)ی (مَلایین الملایین) لە (نصاری) و (غیر)ی (نصاری))، لە (حَق) (أشْقی البشر) نەگوترایە، ئەو (هَذیان)ی ئەوان گوتوویانە، (قابِل)ی (نَقل)نیە، خوا ڕوویان ڕەش کا، وەکی (صحائف)ی (تأریخ)یان بە درۆیان ڕەش کردیە، وە (بَشر)یان لە (نِعمەت)ی (دین)ی (إسلام)

(مَحروم)کردیه، (حظ) ئەکەی بزانی چیان ووتیه؟ بنۆڕه (تفسیر)ی (طنطاوی)، (جلد)ی چواردەمین، لەلاپەڕی (١٩٦)ەوە، (أمّا) ئەوەی چابوو(بعض)یّ وەکی (کارلیل) و (لود هەدلی)وە (کونت هزی) وە (کولیام) پێگەیشتن، دەربارەی (حضرەتی محمّد)ی(ﷺ) بۆ (قوم)ی خۆیان (إبران)ی (حقّ) و (یقین)یان کرد، وە گەلیّ (طعن)یان لە (رؤسا)ی (دین)ی (مسیح)دا کە لە بیّ شەرمی، بەو(وجه) (قبیح)ە (تأریخ)یان گۆڕیه، ئەوان هیچ، لەمەیانی ئێمە لەو(بَین)ە، (مُتسببین)ی (طریق)، خوا کۆریان کاتەوە، (هَذیان)ی خراپ ئەکەن نازانن قسان بکەن، (نزاکەت)یان نیه، (وەقت)یّ (سواد)ی (أعظم) لە (أُمّەت) (شمائِل)ی (رسول الله) (ﷺ) یان ئەزانی، کە (مُراقبه)ی (شێخ)یان هاتە مەیانە، کەس ئاگای لە (شمائل)ی (رسول)ی خودای نەما،ئەبی (شکل)ی (شێخ)یّ بزانن، لە (مُراقبه)بیهیننه بەر (خیالّ)ی خۆیان، (بعض)ەکیان زۆر ناشیرنن، کت و کۆر، ریش پان و درێژ، وەکی جۆرِکی کەریّ، کلکی عەلی شیشی، کە چەتر لیّ ئەدا، ڕەشی گزرەی مل ئەستووری ورگ زەلام، لام وەیه کە ئەیان خەنە بەر (خیالّ) لەترسان ئەهاڕێنن، وە (شیعه)ش تا(قیامەت) دەم لە (تَفّوهات)ناکەنەوە، (دائِر) بەشیشەیی (ناموس)، (ناموس)ی (أکبر) زوبان درێژی ئەکەن، (حقّاً)ئەوە هیچ (رسول)ێك لە ئومەتی خۆی نەدیوە(جلال) و (رفعەت)ی(رسولی أکرم) لە کتابی (خاتم الأنبیاء ) تألیفی مەرحوم(جەلال نوری) دەرئەکەویّ،حقاً (کتێب)ێکە شایانە، هەرکەسیّ (حضرەتی محمّد) (ﷺ)ی خۆش بویّ وەخوێندەوار بیّ، (نسخه)کی لەوە (کتێب)ە لابیّ.

(وەقت)یّ (أربا)ی (تُورك) (مدافعه)یان ئەکرد، (أمّا مُدافِع)ی (جَسور)بوون زۆر قسەی وایان نەکردیه (ملا)یان نەیان ئەتوانی ئەو قسانه بکەن، (قلینجی زادە إسماعیل) (عجایب) ئەدویّ، یەکیّ لە (غربی)یان (طعنه)ی لە (حضرەتی محمّد) (ﷺ)دابوو. (إسماعیل) مودافەعەییّ جوانی کردبوو (نهایەت) ئەی ووت: هیچ نەبیّ(محمد) داك و باوکی (مَعلوم)بوو".

(ملا) ناتوانن ئەو (تعریض)ە بکەن. گەرچی (نقل)ئەکەن لە (ملا)یە زۆر گەورە، لە (أيّام)ی (عبدالملکی بن مروان) چوویتە (ئەستانبول) بۆ (أمر)ی (سیاسی)، (إنپراطور) ڕۆژێ ئەڵێ:" (بَحث)ێ هەیە لەناو (مسلمان)ان لە (حَق) (حَرم)ی (محمّد)ی (ﷺ) (یعنی صدّیقه)، ئەمە چیە؟"ئەڵێ:" بەڵێ، لەوژنە گەورانە دوو، یەکێ (مریم)ە، یەکی (عائشه) قسەی وایان لە(حق)گوترا، (أمّا) (مریمه) کوڕەکی بوو، بێ باب، (لکن) (عائشه) لە مێردی خۆشی (ولد)ی نەبوو" (إنپراطور) و (حُضّار) زۆر (مُکدَّر)بوون، وە نەیانتوانی قسەیە بکەن، کە (ملا) هاتەوە (منزل)ی خۆی ووتی:" خوایە (إیمان)م بە (برائەت)ی (مریمه) هەیە، (لکن) چی بکەم؟ (محل) (إیجاب)ی ئەوقسەی ئەکرد، (أستغفرُكَ وأتوبُ إِلَیْكَ)" بەڵێ ئێمە بە (إتّباع)ی (حضرەتی محمّد)ی (دَفع)ی (وَصمەت) لەوان ئەکەین، ئەوان هەزار هەزار (سیّئات) (نسبەت) بۆ (رسول)ی ئێمە ئەدەن.

قسەی دووەم: هەرچەند زۆر (جسارەت)ە، (أمّا) (حَقٌّ)ە، وە خوا لە قسەی (حَقْ) (حَظ)ئەکا، (جَنابی حق) (غنی)یە، (إحتیاجی)نیە، (عَلیٌّ) و (کَبیر)ە، (أعلا)یە، (فَوقَ الطّبیعة)ە، (لکن نَظر) بە (عالَم)ی (تشریع) و (إعتقاد) ئەڵێن:" ئەوەندەی (جناب)ی (حق) ناوی (محمّد)ی(ﷺ) بڵند کرد، (حضرەتی محمّد) (ﷺ) سەد هەزار هەندی، ناوی خوای بڵندتر کرد (جلال) و (کبریا) و (عظمة) و (قُدرەت) و (قُوّەت) و جاهو (جَبَروت) و (قُدّسیّة) و (عُلویّة)ی خوای، بە (نوع)ێ هاویشتە (دەماغ) و (قلب)ی (أتباع)ی، هیچ کەس وا (مُوفّق)نەبووە (راحەت)ی (لَذّەت)ی خەووخۆراکی، (حیات)ی خۆی (صَرف)کرد، بۆ (إعلا)ی (کلمةُ الله) ئەو هەموو (عَداوەت) و (تَحقیر) و (ذِلّة)و (هَوان) و (عَذاب) و (ألم)ی بۆ (تعلیم) و (تبلیغ)ی گەورەیی خوا (قبول)ی کرد.

لەهەموو (تورات) ئەڵێ:" من بە(هُوَ) خودای ئێوەم"، لە(أسما)و (أوصاف)ی (کبریائی) چیتری تیانیە، (إنجیل) (دعا)یە یە بۆ (عیسی)، (عیسی) چی کرد؟ کردیانە کوڕی خوا، (عَین)ی خوا، لە (عالَم)ی (تأریخ) بێ (أثر)ە، (تأریخ)ی (أنام) ئەمڕۆ (نظر) بە (میلاد)ی ئەو، کەسێ بنۆڕێتەوە

(كُتب)ی (أوائل)، لە (مِلّیون) ئەبینی (إله) و (آله)یان کردینە (مَلعبه) و (موضوع)ی (حکایات)ی پڕوو پوچ، بە (حکایات) هەزار کەسی مردیان زیندی کردینەوە، (أطبّا) چاوی کوێرەموش و (أبرص)و (أمراض)ی (صعب)تر (إزاله)ئەکەن، زگ ئەدڕێنن، گورچیلە دەردێنن، نەخوا، وە نەکوڕی خوان.

لە (بعض)یَ (تواریخ)ی (عمومی)م دیووە، ئەڵێ:" (سبب)ی چیە، ئەو (دۆم) و قەرەجانە ئاوارەن، هەر ڕۆژە، لەجیَ یە، بیَ خان و مانن؟" ئەڵێ:" یەکیَ لە (أوائل)یان، نای زۆر باش لیَ ئەدا، خواش (حظ)ی بە دەنگی (آلات)ی خۆش دیَ (دَفعه)یە خوا هاتە سەر عەردی، گوێی لە نای ئەو کابرایە بوو، لە (طرب) کەوتە (رَقص) و سەما(ألعیاذُ بالله)، کە بە خۆهاتەوە، زانی شتیَ سووکی کردیە، ئەو (خِفّة)ە (سَبب)ی ئەو (شخص)ەبوو، (دُعا)ی کرد: (بڕۆ بیَ (مأوی) و (مسکن) و ئاوارەی دارو دیاربن!) ئاوەها خوا دێتە سەر (شکل)آن! (ألعیاذُ بالله).

(حتّی) لە (تَورات) دەرئەکەویَ، لای (حضرەتی إبراهیم) (علیه السلام) گوشتی گۆلکی بریانی خواردیە، وەچەڕە دووکەڵی، گوشت و قۆچ و موو و پێست و سم و چەورایی قوربانی، (عطر)ی خۆش بۆی خودایە، (ألعیاذُ بالله)، بەکاتی (تَدنّی) هاتە خوار، تاوەکیِ (میقرۆب)ی چووە ناوزگی کچە جوویَ خۆی کردە (عیسی) (عیسی)ی (مُحقّر) و (مُهان) و (مصلوب)ی (یهودی)یان.

نازانم چ بڵێم؟ دڵم لە (أحوالات)ی (بشر) زۆر سەغڵەتە، (میقادۆ) بووە (إبن السَّما)یە گاجووت ئەکەنە خوا، بە (مِئات)ی (ملیون) (سجدە)ی بۆ ئەبەن، (إنّا لِلّه)! (جنابی حق) ئەو دڵتەنگی و (ضَیقه ت)ی لەسەر تۆ هەڵ گرت، دڵی (فراح)کردی (عَیش)ت خۆش بوو، لە دەست (فَقر) قورتاربووی ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ﴾ئەوی تیای بووی ﴿یُسْرًا﴾ (یُسر)یَ (عظیم) ﴿إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ یُسْرًا﴾بە (تأکید) وایە (شُبه)ی نیە، یاخود (وَعد)یَ (مُستَقلّ)ە، (مِن بَعد) ئەگەر تووشی ناخۆشی بووی، خوا خۆشی ئەکا، ئەوە(عام)نیە، بۆ هەموو کەس، لەگەڵ ناخۆشی، خۆشی ببیَ، یا لەگەڵ ناخۆشی دوو خۆشی ببی، گەلیَ هەن،

ناخۆشی نابینن، تا ئەمرن گەلێ کەس خۆشی نابینن تا (رۆح)ئەدەن، گەلێ کەس بە (أكثر) لەخۆشیدایە، گەلێ کەس بە (أكثریەت) لە ناخۆشی دایە، خۆ ئەوەی کەمێ (مُتشائِم)بێ، خۆشی و (ڕاحەتی) و (فَرح)ی چی؟ نایزانی، (دائِم) (عاجز) و دلّتەنگ و بە (بەلایە) ئەوانەی (مُتفائِل)ن، وەکی: (طنطاوی) و (لۆرد ئەڤیری) ئەفەرموون: (دائِم) لە (مَسرّەت)دان، ناخۆشیشیان لا خۆشی یە، ئەو (حالّ)ە زۆر خۆشە، دەبنە (عاشِق)ی (جمال)ی (طبیعەت)، ناشیرینی لە (كائنات)دا نابینن.

لە (سورە)ی (وَاللَّیْلِ) لە (تَفسیر)ی (لِلْیُسری)ی وە (لِلْعُسْری)ی ڕابردوو ئەلّێن:" لە (کتێب)ی (مولود)اندا، ئەلّێ:" خوا چل شەو و ڕۆژی باران بەسەر (هیكل)ی (آدەم)ی داباراند، (٣٩)ی بارانی غەمی، شەوو ڕۆژەکی بارانی (فَرَحی)" وەکی بابم ئەفەرموێ:"تێ یدایە(إشارەت)ێ، تێیدا (بشارەت)ێ" (إشارەت)ەکەی ئەوەیە: خۆشی (دنیا) (نظر) بەناخۆشی چل یەکە، (بشارەت)ەکەی ئەمەیە: لەدوای هەموو ناخۆشیان، خۆشی یە. ئەگەر (نَظر) کەیە (أحوال)ی (دُنیا)ی ئێمە خۆشی (نسبەت) بە ناخۆشی هەزار یەکە، خوایە(آخر)ی خۆش بێ، (إلهی) (رَحْم)ێ.

وە (مَعنا)یەتر لە (شێخ محمد عبدە) وەر ئەگیرێ، (حاصل)ی (إنسان) وائەبێ شتەکی (غایەت)پێ ناخۆشە لای گرانە، کە (دوام)ی لەسەرکرد، لای زۆر (سهل) و خۆش ئەبێ، ئەمە وایە، لەگەلێ شت.

لە گەلێ (مَسلك) (جاری)ئەبێ، (شخص)ێ گوناهی نەکردیە، تووشی گوناهێ ئەبێ، ئەوەندە (مَلول) و (مُتأثِّر) و ئازوردە ئەبێ مەپرسە، بە (تَكرُّر) (أُلفەت)ی پێوە ئەگرێ، (بَعد الدوّام)بێ ئەو ئارامی نابێ (مَشهور)ە لەسەر (أَلْسِنَە)، دووکەس بە دەمەقالّە هاتن، یەکیان بەیەکی ووت:"گەوّاد" کابرا سست بوو، لەرزی، کەوتە سەر ئەرزی، بێ هۆش، (دەور)یان لێدا، ئەمە بۆچی وای لێ قەوما؟ پیاوێ (عاقل)، (سؤال)ی لە (ما جَری)ی کرد (حكایەت)یان بۆ کرد، فەرمووی:" ئەو (إنسان)ە لە(عومر)ی خۆی ئەو جنێوەی پێ نەدراوە،

بۆیە (متأثِرّ) بوو، کەوت بێ هۆش بوو" چەند (دفع)ەکی ئەو (کلمە)ی بە گوێی دادا، کابرا بە خۆهاتەوە! (رجال)ی گەورە گەورەی خوداوەندی (عزم) و (جزم) و (مَتانەت) وای لێ دێ، کاری (غایەت) (صعب)ی، هەتا نەزیکە (محال)ی زۆر دووری، لا(سَهل) و نەزیك ئەبێ (سعی) بۆ ئەکا، (موفق)ئەبێ. لە(بَعض)ێ (مواقع) بە (مناسبە) (ذکر)کراوە، وە (باز (عرض) ئەکرێ، (حُکما)ی (عُقلا) بۆ (جِنَّە ت) دوو (مرکز)یان داناوە، یەکێ لە (دائرە)ی (عقل) بەر ژێر، یەکێ لە(دائرە) بەرە ژۆر، (قسم)ێ لە (رجال)ی (نَوابِغی) و (عَبقری)، (نادِرُ الوجود) بە (منون)یان (تعبیر ئەدەنەوە، ئەڵێن:" ئەمە (جِنَە ت)ی (فَوقَ الغفل)ە، زێڕا کاری وا ئەکەن، (أصلاً غفل) ڕێ نادا، بڕوا ناکا کە ئەوکارە، (إقدام)ی بکرێتە سەرو بکرێ، (غَیرَ)ە (قابِل)ە، (مع انّە) (مُکمّلاً) ئەو نوعەم(ذات)ە ئەی کا، (بَعْدَە) (عقل) سەری بۆ شۆڕئەکا، (سجدە)ی بۆ ئەبا" (بعض)ێ (رجال) لە (عصر)ی ئێمە ئیش وکاری وا ئەکا، (عقل) لە (تصوّر)ی گێژ ئەبێ لەبەر (سیاسەت) ناوێرم بڵێم:" (هِتلر) دووساڵ و نۆمانگە (حرب)ەکی ئەکا، (تأریخ)ی (بشر)نەی دیوە،" بزانین (عاقبەت)ی چی لێ دێ؟!

یەکێ هاتە (خَیال)ی، (إنسان) کەبەر ببێتەوە، هۆشی ئەبینی یان نا؟ چوو لەسەر (طیّارە)یە خۆی فڕێدا عارد، لە (هوا)دا، چەترەکی پێ بوو، هەڵی دا، زانیان هۆشی ئەمێنی دەی دەی خۆیان لە (طیّارة)ان فڕێ ئەدا، سەر (طیّار)ان، (آخر)ی (موفق)بوون (پەڕەشووت)یان دروست کرد، (عسکر)بە (پەڕەشووت) دێتە خوار، خۆی ئەخاتە ناو دوژمن کە کەوتە زەوی، شەڕ ئەکا، (غالب)ئەبێ. (مُدهش) ئەوەیە، ئێمە ناتوانین (خیال)ی کەین ئەوانیش، ئاوا بە (سُهولەت) و (کیف) خۆشی و (شَطارة)ئەی کەن!

(خُلاصە) زۆر (أمور)ی وا هەبوو، (خیال)ئەکرا، بە (مُحال) ئەزاندرا، (بشر) (سعی)کرد، هێنایە (ساحە)ی (وجود)، (مع الأسف) لەم (ساحە)دا ئێمە هیچ (أثر)مان نیە، بێ شووێنین، لە (درس)ی (کلام) ئێستاش خەریکن، (سَلب)ی

(قُدرەت) و (إختيار) لەخۆمان ئەكەين (حقيقهً) (أوّل)ى وانەبووين، (أمّا) وامان لێ هات (إنّا لله) ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ﴾ لەكارى (مهِمْ)بوويەوە، (وەقت)ى (أشغال)ت تەواوبوو﴿فَانصَبْ﴾ خۆت ماندى كە، لە (أوقات)ى (فَراغ)يش (عومر)ى بە خۆڕايى مەدۆڕێنە، بە (طبيعه ت)ى (حالْ) ئەو (نوع)ە (ذوات)ە ئاراميان نيە، (وەقت)بە (ضايع)نادەن، بنۆڕە (تأريخ)ى (أسلاف) (أحوال)ى (بعض)ىٚ لە (رجالِ)ى (عصر)ببيە، شەوو ڕۆژ، (خَبر) دارو بەئاگاو بە (خەبەر)ن، (ألْبَتّه) (تَيقُض)ى (فاروقى) وە (بعض)ىٚ لە (رجال)ى (إسلام)ت بيستووە، وە ئەزانى، لە (زەمان)ى ئەو (نوع)ە ئاگادارانە، (مُلك) و (مللەت) لە (ترقى)دا دەبێ، ئەوانەى (غافلْ) و بە (لَهو) (مشغول)ئەبن، (دەولَەت) لە (أيام)ى وان ئەكەوێتە (زمان)ى (إنقراض)و پەرێشانى، بێ (أمن) و (أمان)، هەرەج و مەرەج (خلاف) و (شِقاق)، (آخر)ى ئەبنە ژێر چەپەلۆك (وَمَنْ رامَ الْعُلى سَهَرَ اللّيالى) (مُؤمِن) بە پێڕەوى (رسول)ى (أكرم) (ﷺ) (مُكلّف)ە، بە (إصلاح)ى (دنيا) و (آخرەت) ئەبێ زۆر ماندى بێ، (حقاً) ئەمڕۆ، ڕۆژى خۆماندى كردنە، ئەوى ئەمڕۆ خۆى ماندى نەكا، وابزانم ناحەسێتەوە، ئەمڕۆ ماندى بوون، بە نوێژو ڕۆژى و (خَتم) و (تهليلە)و ئەوانە، نيە، ماندى بوونە بە (إختراعات)، بە (كشف)ى (قوەت)ى (طبيعة) و(إستفادة) لێكردنى و خۆ ماندىكردن بە خوێندنى (نظر)ى بێ (عمل) خۆڕاييە، كەلَك ناگرىٚ؛ ماندى بوونە بە(تَوْحيد)ى (أفكار) و (قوەت)؛ ئەوى ئەمڕۆخۆى ماندى كا، بەكۆنە قسەى، هەزار وسێ سەد وپەنجا سالْ پێش، ئەبێ چى لە (حق) بلێى؟ كاكى (شيعه) ئەلَىٚ:"ئەمە(أمر)ە، بە (حضرە تى رسول) (ﷺ)، كەلەخۆ بوويەوە (على) دانێ بۆ (إمامەت) و (خَلافەت)" ئەى هەموو، (خلافەتى)چى؟! (مع الأسف) ئێمە (وَقع)مان نەما لەسەر عەردى، ئەو هەموو (مُلك) و (سلطنة)ە لە قيس چوو، (ألان) بستە عەردىٚ نيە، كە لەژێر بالَى (أجانب)نەبێ، مەگەر (بعض)ە جێ يە، بێ كەلَك و (وَجه)، ياخود (إستيلا)ىَ بە (مصلَحەت) نەزانن لەسەر ئەو (حال)ەش، (حالاً مُنازعە)يە، لەسەر (خلافەت)ى (إمامين)– (أبوبكر) يا

(علی)، ئەوا (علی) (خلیفە)ی (أوّل)بوو، ئەوا (علـی) هەرچـی ئـەڵێن، وابـوو، چ سوود؟ قورتارمان ئـەکا، لـەو(رزالـەت)ە، (دفـع) (أجانـب)ئـەکا؟ (مـع الأسـف) خۆی لە (دفع)ی دوژمنی خۆی (عاجز)بوو، لە (حاڵ)ی (حیـات)ی، ئێسـتا چـی ئـەکا؟ وەکـی (عیسـی) لەبەرجولـەکان هەڵـدەهات بەئومێـدین لـە ئاسمانـان بێتەخوار، (دجّال)مان بۆ بکـوژێ، هـەی هـاوار، خوایـە هـاوار ئەمـە(جنّـە ت)ی (دونَ العَقل)ە، (ربّي) (شفا)یە، ئەتانی شێتان (عاقڵ)کـەی (ربّـی) بـە (کـرم) و (لُطف)، (عقڵ)یێ (کرم)کەی، (دَرك)ی (مصالِح) و (مفاسد) بکەین، ئێوەو خودا (أُمّـەت)ی (محمّـد) (ﷺ)، (أئمّـە)و (أولیـا)یـەکان چیان بۆمـان کـرد؟ وا بـە (ألهە)یـان ئـەزانین، هـەر (فِرقـە) یـەکێکی کردیتـە خـوای خـۆی، (لعنـەت) لـە (فِرقە)کی تر ئەکا .

(ملا)یە (شـیعە) لـەو چـەندانە، (کتێـب)ەکـی دانـابوو، بەگـژ (بِلال) و (أبـو هریرە) و (شێخی بُخـاری) و ئـەو (نـوع)ە (ذات)ە داچـوو بـوو، لـە (مەیـدان)ی (جدال) و (قتال) وەکی (عَـنتر) (طعـن)ی لەوانـە ئـەدا، ووتم:" مـاڵ وێـران تـوو ئەمڕۆ، بۆ بەگژ (هتلر) و (موسولینی) و (ستالین) داناچی؟، چیتە بەسـەر ئـەو (فقیر)انەی رابردووی؟" (الآن)یش (أُمّـەت) و (رُؤسـا)ی (أُمّـەت) خـەریکی ئـەو جۆرە، ئەو(سفاهەت)ەن، (إنّا للّه).

﴿وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ (أمل)ی هیچت بەکەس نەبێ، (فرق) و جـودایی مەکـە، (مقصـد)ت (رضـا) مەنـدی خودابـێ . (أساسـاً) (حضـرەتـی محمّـد) (ﷺ) (قبول)ی (رسالەت)ی کرد، لەگەڵ ئەو هەموو (مشقّەت) و (بَلا) و (عداوەت) و (حقارەت) و (تعذیب)ە، (مقصود)ی (إجرا)ی (أمـر)ی (بـاری) و (رضـا)مەنـدی (حضرەت)ی (حق)بوو، چاوی لەهیچ نەبوو، وەکـی (هیکـل)بـەگ ئەفـەرموێ:" (عَتبە بن ربیعە)، (عرض)ی (محمّد)ی کـرد": ئـەی بـرازا، (موقـع) و (نَسـب)ی توو، ئەزانی لای ئێمە چۆنە؟" (یعنی) چـەند بڵنـدو گـەورەو (مُحتَرَم)ە، "بـەو (دەعوا)ی (رسالەت)ە (نەفرەت)ت خستە (بَین)ی (قـوم)، (مقصـود)ت چیە؟ ئەگـەر (مـاڵ)ە، تـا ئەوەنـدەت(مـاڵ) بـۆ کـۆ کەینـەوە، لەهـەموومان

دەوڵەمەنـدتربی، (مقصـد)ت (شـرف)ە، تـا هـیچ کـاریّ بـیّ تـوو نەبڕینـەوە، (مقصـد)ت پاشـای یـە، بتکەینـە (مَلـك)ی خۆمـان، جنۆکـەت لەسـەرە، تـا (طبیب)یّ بانگ کەین (تداوی)ت بکا" (عَتَبـە) دوای (إستماع)ی (بعـض)یّ لـە (آیات)ی (قرآن) لـە (أوائـل)ی (سـورەت)ی (فُضّـلَتْ)، زانانـدی، (خَیـال)ی وان (هَبا)یە، (فکر)ی (محمّد)ی لـەکیّ؟ وە (خیـالات)ی وان لـەکیّ؟ (مـال)ی چـی؟ ئـەو (نَـوع)ە (شـرەفە)ی چـی؟ (مُلـك)ی چـی؟ (جنّـەت)ی چـی؟ چـی بەسـەر چیەوەیە؟ (محمّد) (ﷺ) (داعی إلی الخَیر)ە، (داعـی إلی الحـقّ)ە (حقّـاً مُـراد)ی (مُحمّد)ی، بۆ (رضا)مەندی خـوداو (خـلاص)ی (بشـریّەت)بـوو، لـە (دنائـەت)و (رَلـەت) و (لَئیمـە ت) و خـواری و (أسـارەت) و (عُبودیّـەت)، (ترقّـی) (روحـی) ئەوەیە، بە (نسبەت) بلّندی خودایان بلّندبن، (لکن مع الأسـف) (علـی الأكثـر)، (طبـع)ی (بشـر) لەسـەر (دَنـائـەت) و پەسـتی یـە، (حتّـی) ئەوانـەی گـۆی یـا (تَـزکیـە)ی (نَفـس) ئەکـەن، (فَـرق) لـە (بَـین)ی پـاك کـردن و (دَنـائـەت) و (رزالەت)ناکەن، تڕان ئەکەنن، وەك کەریّ دەزەڕن، رووی خۆیان ڕەش ئەکـەن، شەقیّ تێك هەڵ ئەدەن، دەڵێن:"هەتکی (نَفس)ە" هەتکی (نفس) دروست نیە، ئەبی (نفس) (تقدیس) بکریّ، (لە (زوائل) پاك کردێتەوە، گـەورەبیّ، گـەورەیی خۆی بزانی، (غیر)ی (خالق)ی (أقـدس) و (أعظـم) و (ذات)ی (واحـد)ی (واجـب الوجود)، کەس (حقّ)ی (معبودی) لەسەروی نیە. ئومێد وەیە خۆمان خـەریکی (نَـواجی) و (خَـوارجی) و (شـیعایەت)ی و (فرقـە) چـییەتی نەکـەین، بـە (مصالح)ی (دنیا) و (ئاخرەت مشغول) بـین، بـەڵکو لـەو (ذلّـەت)ە دەردەچـین (نظـر) بـە (حـال)ی خۆمـان، خـوا (شـرح)ی (صـدر)مـان بکـا، (رَبِّ اشْـرَحْ لَنـا صُدُرَنا، وَیَسرْ لَنا أُمُورَنا)، (آمین) تەواوبوو (تفسیر)ی (سُورە الشَّرح)، (مـع أنّـە) زۆری ماوە.

سورەتی (وَالتِّين):

(نۆبەت)ی (تفسير)ی (سورەت)ی (وَالتِّين)ە، گەرچی (مع الأسف) ئەمساڵ لەبەر سەرسامی زستان دار هەنجیر بە (أکثریەت) هیشك بووین، لام وەیە ئەوساڵ سوێند بە هەنجیر ئەخۆین، (جَمهور)ئەڵێن:" (مَکیّە)" (قسطلانی) (إشارەت)ی بۆ (خِلاف)نەکردیە، (أما سید نقل) لە (قتادە)ئەکا، فەرموویەتی:" (مَدِینَة)" منیش (نظر) بە (مدینەت) ئەوەم لا خۆشە، (عَدد)ی (آیات)ی هەشتە، (مناسبە)ی لەگەڵ (ماقبل)ی وە (مناسبە)ی (مَحلُوفُ بِها)یان لەگەڵ (مَحلوفُ عَلَيْه) لە مەیانی (تفسیر) دەرئەکەوێ.

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾

﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ وَطُورِ سِينِينَ وَهَذَا الْبَلَدِ الأَمِينِ﴾(إختلاف)ی (مُفسرِّين) لە (تین) و (زەیتون)زۆرە، ئەوەی ئەڵێ:" (مُراد) هەنجیر و زەیتوونی (مَعروف)ە" (تَوجیە) ئەدۆزێتەوە، بۆ سوێند پێ خواردن، چەند (خواصّ) و (مَنافع)یان (بَیان)ئەکەن، کە ئاڕاستەیان ئەکا، بۆ ئەو (مَنقَبە)، ئەوانە (آخر)ی (أشیا)ن کە خوا لە (قرآن)سوێندیان پێ ئەخوا، ئەبێ زۆر (لایەق)و شایان بن، یەك ماوە، چەند (سورەت)ێ لە مەودوا دێ، دار- (خاصَّةً)-ئی وەك:هەنجیرو زەیتون وەکی (حیوان) و (إنسان)، (صاحب)ی (عملە)ی (طبیعی)ت، (غازیە)، (ماسِکە)، (هاضمە)، (دافعە)، (مُولّدَە)، (آثار)ی (شُعریریە)ی کە لە (عروق)- یاندایە، (مُجّبِرة)، (بعض)ێ لە (مُجّدد)ان ئەفەرموون:" دار (حەیوان)ێکە (ثابت)، (حیوان) دارێکە (مُتَحَرِّك)" (أمّا) قسەیە ئەکەن لە (حق) هەنجیر (إمام)یش ئەی فەرموێ، وە (بعض)ێ (کلمات)ی (شاعر)ێنەیان (إجرا) ئەفەرموێ، گۆی یا هەنجیر، پێش (وَرق)ی بەر دەردەکا، ئەوانیدی گلووکەی ئەدەن، (ورق)یان دەردەکەوێ، ئەوجا بەریان (ظاهر)ئەبێ، ئەوە وانیە، ئەو باقۆی (أوّل)ی دەری ئەکا، نابێتە هیچ، زەرد ئەبێ، وەکی باقۆی بابردی

(سقوط)ئەکا، هەنجیرە ڕەیحانی، تاکو توك ئەیکاتە هێلە، هێلەش ئەوەندەنیە وە هەندەش بە تام نیە، (مدح)ی بکرێ، یا (مدح)ی پێ بکرێ، بەڵکوو هەنجیر، دوای هەمووداری بەبەر، بەری دەردەکەوێ، (طُور)ی (سینین) چیایە بەگیاو دارو بارە، لەو چیایانەیە، هەنجیرە دێمەکاری لێ پەیائەبێ، وە(زەیتون) دارێ ئاوێ نیە، لە وڵاتی ئێمە لەسەر (قبر)آن ئەی چێنن، بێ ئاو (دائماً) سەبزو خوڕەمە ئەگەر (إنسان)ی بە (سلیقە)مان هەبا، (ممکن)بوو، (أکثر)ی چیای وڵاتی ئێمە ببێتە باغو باغاتی زەیتوون، (نَظر) بە (زمان)ی ئێمە، شەرەفێ گەورەیە بۆ چیایە بە دارو بارو و گیاو گوڵ بێ لە کێوی "پیرمام)" بە ناوی (صلاح الدینی أیّوبی کوردی)، بو (ملك)ی (محبوب)، (ملك فیصلی ثانی)، (وصّیی)ی (مُحترم)ی (أبنیە)ی (فاخِرە) و (شاهِقە)ی لێ دروست کرایە، (واقعاً) ئەو (نوع)ە چیایانە زۆر بە (خێر)ن، وە پڕ لە (معادن)ن، بە (أکثریەت) لەهەموو شیوو دۆڵانیان ئاوی لێ دەردەکوڵێ، وەکی ئاوی (کَوثر)، (صاف) و (برّاق) و ساردوخۆش.

(وَبَلَدَ)ی (أمین)، ئەگەر (مَراد) (مکّە)بێ– کە ئەفەرموون:" (خلاف)ی تیانیە"– تا (فتح) نەکرا، چ (وَجە)ی نەمابوو، ببێتە (جِهە ت)ی (سوێند) پێ خواردن، ئەوەندە نەبێ، (أمین)بوو، بۆ (غیر)ی (رسول) و (أهل)ی (إیمان)، ئەوی چووبایە، لە (أمان)دابوو، (وَلَو قاتل)با، (أمّا) وەکی لە (تفسیر)ی (سورەت)ی (بَلَد) فەرموویان، (عذاب) دانی (حضرەتی محمّد) (ﷺ) و یارانی (مُباح) و (حلال)بوو، بەڵکو لایان (واجب)بوو، (مکّة) گەرچی (بِوادٍ غَیْرِ ذی زَرع)داندرا، (أمّا) لە سایەی (خلیل الرحمن، حبیب الله) تائێستا، لەهەموو(آفاق)، (تین) و (زەیتوون) و (ثَمرات)ی (کُلِ شیْء)، (حتّی) بەهێ ی (أصفهانی) بۆ (سوق)ئەکرێ، وەچیای (مکّە) هەرچەند، بێ گیاو داروبارە، (أمّا منبع)ی (وَحی إلهی)یە، کە (معدن)ی هەموو(خیرات) و (حسنات)ە، بەهەزار (دَرجة) لە(فَوق)ی (ثمرات) و (خیرات)ی (طبیعة)، وە (مملکەت) هەرچەند، بەئاوو دارو باغ و راغ و (زرع) و (خیرات) و (برکات)بێ، کە

(أمنیەت)نەبێ، گشتی (هبا)یە، بە کوردیش ئەڵێ:"شاری (أمین)ە ڕێ یە(أمین)ە، ولاتێ (أمین)ە" چەندێ لەمەوپێش سەپان لەبەر بەری دوونەی هەڵئەستا، ئێواران کە دەهاتەوە ماڵێ، دەست نوێژەکی ئەشوشت، نوێژێ باشی کرد، ئەپاڕایەوە لەبەرخوا:" (ربّی) هەرزانی کەی، هێمنایی کەی، (توفیق)ی پاشای (إسلام)بدەی (روح)ی (حَیات)، هەرزانی و (أمنیة)ە .

(قَسم) بەو (أشیا)یانە ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ﴾ ئەو (جنس)ە (حسن)ە، بێ (نَظر) بەلای (إیمان) و (کفر) و (صلاح) و (فجور) ﴿فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ لە (أحسن)و جوانترینی (صُورەت) و (أشکال)آنی (خلق)کردیە، بنۆڕە ئەو (قەد) و (قامەت)ە ئەو سەرو ڕوو وگەردەن و سینە، سەرتا (قَدم)، چەند جوانە؟ چەند شیرینە؟ ئەگەر بچی بۆ (تشریح)ی (عِلمُ الأبدان)، (عجایبات)ی (صُنع) و (دقایق)ی (خلق) و (إیجاد)ئەبینی، (مُتَحیِر)ئەبی، ئەی (إنسان)، لەخۆت، لە (خلق)ی (کائنات) (غافِل)ی (جنابی حق) (جَلب)ی (نظر)ت ئەکا، بۆ (نظر) لە (أحوال) (ممکنات)– خاصّە (شریك)ی (حیات)، داروباری (نافِع) و (لَذیذ) و (عَزین)، (غابات)، مێرگ و مێرغوزاری کێوان، (عطف)ی (نظر)ت ئەکا، بۆ (مدنیەت)، (حیات)ی (إجتماع)ی (بشری)، ئەوجا (جلب)ی (نظر)ت ئەکا، بۆ خۆت، (إنسان) لەخۆی لە هەمووشتێ (غافل)ترە، ئەگەر خۆی ناسیبا، (قط) خۆی وا (ڕەزیل)نەدەکرد، (سجدە)ی بۆ دارو بەردو (حیوان)نەدەبرد، خۆی بە (سُلطان)ی (عالم)ی (حیات)ئەزانی، (فکیفَ) بە (جِماد)؟! لە توو (خَلق)ی (فِطری) و (خَلق)ی (شرعی) گردبوویتەوە، قەدو قامەتێ (مُستقیم) سەرئەفراز، تالە (خدمەت) خودا (ثابت قَدم)بی، بۆ کەس سەر فروودی نەکەی، چەند (أعضا)ی تووی، بە (مفاصل)و جومگە، وێك بەستیە تابۆ (واحد)ی (أقدس)، (قد)ی خۆت دووتا کەی، پشتی خۆت ڕەق نەکەی، بە باری گوناهان کرتەکرتی پێ نەخەی، ئەتوانی زانوو بەزەمین لەسەر عەردی دانێی بۆ ئەو خوایەی کە تۆی وا (خلق)کردیە، سەری (عُبودیەت) و فەرمان بەرداری بۆ ئەو دانووێنی، ئەو (فِطرەت)ە بە (کُفر) و (ضَلال) و (فجور)، پیس مەکە، خوا بە (أحسن)ی

(تقویم)، (بَدن)ی وە (روح)ی وە(نفس)ی وە (غفل)ی تووی بلّند کردیـە، خـۆت نەوی مەکە، ئەوانەی گاو کەرو بوت و بەردو چیاو دارو سەگ و ماسی و پشـیلە (تقدیس)ئەکەن، (حقاً) بەد (سورەت) و بەد (سیرەت) و بە دهۆش و بەد(عقل) و بەد گەوهـەری بـووین، لـە ژێـری هـەموو بـەرەژێرانن، (إنسـان) کـە خـۆی بـە (سفالەت)ە (راضی)بێ، وە (حظ)ی پـێ بکـا، (فـاطِر) بـەگوێرەی (طبـع)ی وی ئەکا.

﴿ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ﴾ لەسەگ کەمترە، زۆریـان (رذائـل)ی وا ئەکـەن، (حیوان) (دەعیـە)ی نایـەنێ بیکـا، لێـرە چـونکی هـەردوو (خـەلق) تێکـەڵاون، (مُفسّـرین) نـەختێ (مُشَـوَّش)ن (أمّـا) مقصـد (خلـق)ی (تلکیفـی)یـە، (إنسـان) هەرچەند جوان بێ، کە (أعمال)ی ناشیرین بێ ناشـیرینە، وەئـەوەی ناشـیرین، ئەگـەر (أعمـال)ی جـوان بـێ، جوانـە، لەسـەر دلأن (خفیـف)ە خۆشەویسـتە، ئەڵێن:" (حکیم)ێ بە کوڕی خۆی ئەگوت:" ڕۆڵـە ئەگـەر جـوانی بـە (أفعـال)ی (قبیحە) خۆت ناشیرین مەکە، ئەگـەر ناشـیرینی بـە (أفعـال)ی ناشـیرین خـۆت ناشیرینتر مەکە"، من ئەڵێم:" بە (أفعال)ی (حَسَـنە) خـۆت جـوان کـە" وەکـی (خیّام) ئـەڵێ:" (إنسـان) بـە (صـوەرت)ی (صـفەت)ی (حشـر) ئـەکرێ، ئـەوی (صفەت)ی چاك بێ (أخلاق)ی (حمیدە)بێ، لـە (غایـەت)ی (حُسـن) و (جمـال) (بعث)ئەکرێ، ئەوی بەد (صـفەت)و بـە (أخـلاق)ی (مذمومـە)بـێ، لـە (غایـەت) ناشیرینی، ئەخرێتە (مەیدان)ی (حَشر).

﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوان (دائماً) لە (ترقّی) و (تعالی)ن، بۆ لای (مَلا)ی (أعْلی)بالاّ ئەچن، (کریمُ الطَّبع، عزیزُ النفّس، عالی همَّة) بلّنـد پایـە، گەورەیێ بە (تواضع)، بێ (تَنَزُّل) بۆ (غیر)ی خوا، (زِلّە ت) (قَبول)ناکـا، خـۆی بە کەمینبەنـدەی خـوداو (سـلطان)ی (خَلیقـە)ئـەزانی، (قیمـەت)ی هەمووشـت ئەزانی ﴿فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾نابڕێ، وەکی (آثار)ی (خَیْر)یان.

لە(حرب)ی پێشی (قائد)ێ (فرەنسی)، کە (داخ)ی (قـدس)بـوو، (خطـاب)ی کـردە (مسـڵمان)ان ووتـی:" ئـەوێ ڕۆژێ (فـاروق) و (صـلاحی أیّـوبی)هاتنـە

(قدس) بە (فاتحی)، چ (معامل)ەکیان لە (حق أجانب)کرد، ئێمەش ئیمرۆ (أحسن)ی (مُعامله) لە (حق) ئێوە (إجرا)ئەکەین". دەك لاڵ بم بۆتان (عُمر) و (صَلاح) ئەویَ رۆژێ، (حیات) و (شرف) و (ناموس)ی (مسلّمان)ان (حفظ)بوو، لەسایەی (شرف) و (إنسانیّەت) و (عُلویەت)ی وان، (دەخیل)تانبم، لەگەڵ (قَوم)و (أجانب) هەر چاکە بکەن، بێ (حرمەت)ی مەکەن، وە (إلاّ) بێ (حرمەت)یتان دێتەرێ. دیتتان لەشکری (مسلّمان)آن چیان بە (أرمەنی) و (سائر)ی (أجانب)کرد؟ ئەوانیش چیان بە (مسلّمان)آن کردەوە ! (خیّام)ئەڵێ:

مَعشوق ی عُومرش چو غەمەمم باد دراز

ئیمروز بە نەوەتلّطفێ کەرد ئاغاز

بر چەشمی من ئەنداخ دەمێ چەشم و برفت

(یعنی) کی نیکوبی کون و در ئاب ئەنداز

﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ؟﴾ ئەی (إنسان)چیە، (سبب)ە، بۆ (تکذیب)ی (دین)؟ بەڵێ (دین) چ نیە، بێ (أصل)ە، بە (واسطة)ی ئەوە خۆت ئەبی بە درۆزن، بنوارە بە چاوی (إنصاف)، بە (نظر)ی (عقل) و (إعتبار)، (دین) بۆ (حیات)ی (إجتماعی) بۆ (مدنیّەت) و (حضارەت)، (روح)ە، (هیکل)ی (إجتماعی)بێ (دین)ناژیە، (حیات)ی (لذّەت) نابێ، تەماشاکە (إنسان) لە (دین) دوورکەوتنەوە، چی ئەکەن؟ ئەگەر (مثقال)ە (ذرە)یە (دین)، (إعتقاد) بەخوا (تأثیر)ی مابا، چۆن شارێ پڕ لە منداڵ و ژن و (فقیر) و (مسکین) و پیرو ناتەوان، چۆن بەو (نوع)ەی لەگەڵ ئەکرێ؟ بۆمبەردومان ئەکرێ!

(حُکما)یان ئەیان ووت:" (دین مانع)ی (ترقّی)یە، (کشف)ی (أسرار)ی (طبیعة) بە (دین) ناکرێن، (بشر) لە (أسفل السّافلین)دا دەمێنێ" بوونە دوژمنی (دین)، (إعتقادیات)نەما، (موادّ)ی (جهنّمی)، (آلات)ی ویّرانی (إختراع) کرابوو بە (سبب)ی (هلاك)ی (بشر)، خۆزی ئەو (تَرقّی)یە نەبا، ئەو (سیّئات)ەش نەدیترابا، بە (تَرقّی علم) (رَحم) و (إنصاف) و (مُروّەت) و (مَحبّەت) نەما، لەسایەی ئەو (ترقّی)یە (أخلاق)ی (بشر)ی (محو)بوو .

(واقعاً دین)ی (عیسی) بە (دین حساب)نیە، (دین)ی (پاپا) و (دین)ی (قساوسە)کانە، ئەمڕۆ (ئاوروپایی) پەشیمانن لەدەست بێ (دینی)، بێزارن، (علاج)یشیان ناکرێ، بۆ (إسلامەتی)نایەن، (إسلامەتی)ش (بعض)ێ (خُرافات)ی تیایە، (تصفیە)بکرێ، (جَوهر)ی (رُوح)ی (مُجرَّدە) مایەی (ترقّی)، (حقیقی)یە (إعتقاد) بە (وحدانیەت)ی (حق)، بە (حقّیقەت)ی (رسالەت)ی (محمّد)ی (ﷺ)، وە ئەوەی ئەو (تصدیق)ی کردیە، ئەوجا، (سعی) بۆ (صَلاح)ی (دنیا) و (قیامەت) (إعتقاد) بە (دَجّال) و کەری (دَجّال)، بە (مهدی) بە (نُزول)ی (عیسی)، بە (تصرّفات)ی (إمام) و (أولیا) و (قطب) و ئەوانە، لە (فکر)کرێ، (إنتساب) بۆ ئەو (إمام) نەمێنی، بنۆڕنە (حَق)، ئەو (حُکم)ی (حَقّ) و (مُوافق)ی (إدارە) و (نِظام) و (إنتظام)ی (عام)بوو، (قَول)ی هەر (إمام)ێ بێ، (قَبول) بکرێ، (روح)ی (حیات) و (حَزم) و (جَزم) و (عَزم) و (قُوّەت)ی (إرادەت) بخرێتە (دەماغ)ی (مسلّمان)آن، وەکی (أوائل)ی (صَحاب)آن، ئەوی (مُوجب)ی (عداوەت) و (تفرقە)بێ، (إمحا)کرێتەوە، بۆ (إعلا)ی (کلمە)ی (حق)بە گیان و دلّ تێ کۆشین، وە ئەوی (رئیس)ی (حکومەت)ە، خۆشی (روحاً، معناً) گەورەو (قیمەت) داربێ، وە(مقام)ی لای (أُمّەت) (فَوق)ی هەموو (مَقام)آن بێ، بە (واجبُ الإطاعە) بزاندرێن (محبوبُ القُلوب)بێ، (إنَّ المحِبَّ لِمَنْ یُحِبُّ مُطیعٌ) . (کُلّ)ێ کەس بەگوێرەی (حال)و (مسلك)ی خۆی، بێیتە (عُضو)ی (عامل) و (نافع) لە (جسم)ی (إجتماعی) و (مدنی)، (إنسان) بەو (نوع)ە بە (دین)بێ، (حیات)ێ (دُنیا) ئەبێتە نموونەی(حیات)ی (جنّەت) (دین) پەرژینی (روح)ی ژینە، گەلێ جار وتوومە: ئەو باغاتی لە چیاو چۆلان بوو، (دین) بەخێوی ئەکرد، کە (دین ضعیف)بوو، باغاتەکان هەموو بەڕەلآبوون ئێمە (سواد)ی (أعظم) لە (بَشر) (سبب) بەبێ (دینی)، پەرێشان بووین، (مال) و (ڕاحەت)و خۆشیمان نەما، (بعض)ێ کەس، بۆ (خاطر)ی (لهو لعب)خۆی کەم (دین) ئەکا، تاگوناهی بۆ شیرین و بە (لذّت)بێ، ئەمڕۆنا سبەی (نادِم) ئەبێتەوە (حُکم)ی بە (حَق)، بە (حق) ئەوەیە، کە لە (طرف) خودابێ.

﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ؟﴾ بەڵێ خوا (أحكم الحاكمين)ە، چونكی (ربُّ العالمين)ە، (أحوال)ی (روح) و (نفس) و (میل) و نێكی و بەدی -(بِحَقٍّ) ئەزانێ، رێ ی (إصلاح) دادەنێ بێ (میل) و (محابا)، (حُكم)ی لە (حُكم)ی هەموو(حاكم)آن (محكم)و چاترە .

(شريعەت)ی (إلهی) گەلێ (مسائل)، (حواڵە)ی (دقتور)ئەكا، (دقتۆر)ی (مُسلم)ی (عدل)، (يَعنى مَوثوقٌ بِه)ی بێ، بە (رەشوەت) و (میل) (راپۆرت) نەدا، وە گەلی (مسائل) ئەبێ (دقتورە) خاتوون بێ (ملاحظە)ی بفەرموو، لەسەر ئەو (حال)ەش (دِقّەت)ی (مسڵمان)ان كە، (حتّى) ئەمڕۆ چەند بێ (طبیب)ن؟ (طبيبة)، هیچ هیچ (قصور) لە(دین)نیە .

(بَشر) (خاڵ)ی نابێ لە (میل)، (مُطلقا) تەرازووی (مَیل)ئەكا، (وَلَوْ) ئاگاشی لەخۆی نەبێ، ئەتوانم بڵێم:" ئەو (مُجتهد)ەی بفەرموێ:" (غیر)ی (عەرەب) (كُفأ)ی كچە (عەرەب)نیە" یا (سیاسە) وای فەرمووە، یا (تأثیر)ێ (خفی) (قَومیەت)ە، ئەگەر بنۆڕینە (قومیّەت) هەر (قَوم)ە خۆی گەورەتر (حساب)ئەكا، (أنجب) و (أشرف) و (أكرم)ی (شُعوب)ی (بنى آدەمی)یە، (أمّا) وا نیە، (أسباب)ی (مجد) و (شرف) دیارە، بەلاف و گەزاف نابێ، (رسول)ی (أكرم)(ﷺ) (رسول)ی هەموانە، (فرق)ی كوردو عەرەبی لانەبووە، (شریعەت)و (دین)ی ئەو، لە ئالآیشی (قَومی)و (حَزبی)پاكە، (قانون)ی (بشری) (حتّى) ئەمڕۆكە (عَصر)ی (علم) و (نُور)ە، (خالّی)نیە، لە (میل) و (محابا) . زۆر جار ئەڵێم:" ئەوەی (قانون) دادەنێ، ئەڵێی قەرداری (مُجرم)انە، زۆر (طرف)داری (مُجرم)آن ئەكا (خصوصی) (سیاسەت)ی ئێستا، گشت (قانون)ی (بشری) تێك دا، وەكی (شێخ رضای طالەبانی) ئەڵێ:

قانونی (إلهی) وارا كون (یعنی) (شریعەت)

قانون (هذیان)در، چ (أساسی)، چ (سیاسی)

(سەرامەدان)ی (سیاسەت) (قانون)یان كردە، (تابع)ی (هوا)ی خۆیان، (یارَبّ) ی توو (أحكَمُ المحاكمين)ی، (فاحْكُم بِالْحق)، (سُنّە ت)ە پاش

(قرائەت)ی ئەو (آیەت)ە بڵێی: " (بَلى وَأَنا عَلى ذلِكَ مِنَ الشاهِدِينَ)" (أَمّا) ئەبێ (شاهدی)یەکی لە (عِلم)ەوەبێ، بە (فکر) و (عقل)نێك و بەدی بزانی، (تَطبیق)ی (تَشریعی)بکا، لەگەڵ (أحکام)ی (بشری)، (بعد المحاکمە)، ئەو شاهدی یە بۆ (ملا)یان زۆر جوانە، (موافق)ە (حقّ)ە، لە (عِلم)ەوە ئەبێ، نابێتە (تقلید) ئەوەندەش هەیە، لەگەڵێ (أمور)، (شریعەت)ی (وضعی)، (حُکم)ی (حوالە)ی (أصحاب)ی (رأی) و (تدبیر)ئەکا، وە (رئیس)ی وان (ملك)ە (إمام)ە، ئەوەی ئارەزوویەتی قسەی زۆرییە، لە (تفسیر)ی (تین) و (زەیتون)، (مراجعە)ی (تفسیر)ی (کبیر) و (روح المعانی)کا، ئیتر ئەوەندە (کافی)یە، (حَسب الوقت) بۆ (تفسیر)ی (سورە التین).



## (سُورەت)ی (إقرأ)

### (نُوبەت)ی (تَفسیر)ی (سُورەت)ی (إقرأ)ە

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾

(سُورەت)ی (اَلْعَلَق)یشی پیٚ ئەڵێن، چەند ڕۆژ (تأخیر)بوو، لەبەر ناخۆشی و نەخۆشی، لە (عدد)ی (آیات)ی (إختلاف)هەیە بیستە، نۆزدەیە، هەژدەیە، (أمّا) لە(مکیّەت)دا (خلاف)نیە، (بِنا) لەسەر (روایەت)ی (بَخاری) و چەند (ذَوات)یٚ (مُعتبرُ القَول)، (أوائل)ی ئەم (سُورەت)ە، (أوَّلُ ما نُزِّلَ مِنَ القُرآن)ە، ئەفەرموون:" (جناب)ی (رسالەت پەناه)، هەندیٚ پێش (رسالەت)، تەنهایی بۆ خۆش کرا، (یَعنی) طبیعةً)بوو، (جَعلی)نەبوو، (تَشریف)ی ئەچووە (غارِی حِرا) لەمانگی (رمضان)یٚ، وەکی (هیکل) ئەفەرمویٚ، (ئەچووە (غاری حِراء)، ئەوەش (غار)ێکە لە (أعلا)ی چیایە، کە دوو (فُرسخ) لە (شمال)ی (مکّە)یە، وە (آلان) پیٚ ی ئەڵێن:" (جَبَلُ النُّور)" لەویٚ (عبادەت)ی ئەکرد. (أما عِبادەت)ی چی بوو؟ بە (یَقینی) (معلوم)نەکراوە، (عُلما)ی (أصول) بە (خیالٚ)، یەکیٚ ئەلیٚ:" لەسەر (دین)ی (نوح) (عبادەت)ی کردیە" یەکیٚ ئەلیٚ:"لەسەر (دین)ی (إبراهیم)" دیگەریٚ ئەفەرمویٚ:"لەسەر (دین)ی (موسی)" نەخێر بەڵکوو لەسەر (دین)ی (عیسی)" (أقوال)ی بیٚ (دَلیل)، (ظاهر)وەیە، (عبادەت)ی (عبارەت)بیٚ، لە (تَفکّر)، (تَفکّر) لە (خلق)ی (سماوات) (أرض) .

ڕۆژیٚ (ذات)یٚ بۆی (تَمثُّل)کرد، دیارە بە (صورەت)ی (إنسان)، فەرمووی:"(إقْرَأْ)"، بخوونە، (محمّد) فەرمووی:" (ما أنا بِقارِئ)" ئەمن خوێندەوار نیم، ئەفەرمویٚ:" ئەو (ذات)ە لەباوەشی کردم، ڕای گوشیم، تاسست بووم، بەری دام" فەرمووی:" بخوێنە" ووتم:" خوێندەوارنیم" باز ڕای گوشیم، تا (شل)بووم، بەری دام، لە (نوبەت)ی (ثالث)، فەرمووی:"﴿اقْرَأْ

بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ لە هيچ (روايەت)ێ نەماندیووە، كە (بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لەگەل (نازل) بووبێ، (ذاتاً قرائەت)ەكە، بەناوی خودای (محمّد)ی یە (ﷺ) (دقّەت)كە زۆر (لطيف)ە ﴿الَّذي خَلَقَ الإنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ ئەو (ذَرَّة)ی (حَيَويَّە)ی كە بەو لولەی مێوە ئەنووسێ ﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأكْرَمُ الَّذي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ دیارە (كِتابەت) (أثر)ی (أكْرَمِيَّە ت)ی (كِبريائي)يە، (حَق) وایە (إنسان) (سَعي)كا، تابێتە (مَظهر)ی إكرام)ی خوای، (مع الأسف)بە (أكثريەت)، (قَوم)ی ئێمە لەو (إكرام)ە (محروم)ن ﴿عَلَّمَ الإنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ (ذات)ە كە لەبەر چاوی بزر بوو، (حَضرەت) بە تالّووكە، دڵی لەترسان لێی ئەدا، ڕنگە ڕنگی، ئەكرد، دڵە كوتەكێ ی پێوە نووسا، بەو ترس و لەرزە، چۆوە ماڵێ، فەرمووی: "(زَمِّلُوني زَمِّلُوني)"دام پۆشن، دام پۆشن، دايان پۆشی تاترسی بەسەر چوو، (ماجَرا)ی بۆ (حضرەتی خديجە) گێڕایەوە، (حضرەتی محمّد)ئەترسا لە (جِنّة)، (رَفيقة)ی (حيات)ی، (مُونس)ی (خلوەت)ی فەرمووی: "(حاشا) خوا تۆ (ڕەزيل)ناكا، تۆو (صاحب)ی (مكارِم)ی (أخلاق)ی، دووری لە (جِنّەت)" (حضرەتی خديجە) بردیە لای (وَرَق بنی نَوفَل) لە (بَنی أعمامی خديجە)بوو، بووبوە(مسيحی) ئاگاداربوو، ووتی:"ئەو (ذات)ە (ناموس)ی (أكبر)ە، (يَعني) (أمين)ی (وَحی)يە، (حضرەتی جبرەئيل)ە ئەو (ذات)ەيە، كە (تورات)ی بۆ (موسی) هێنایە"- (ذاتاً معلوم)نیە، (إنجيل)ی (عيسی)چيە؟ (أصل)ی (حفظ) و (تدوين)نەكرا، ئی دوايە، نووسراوە، چ نيە (دیعایە)يە- (وَرَق)ە ووتی:" خۆزيا، ئەو (وقت)ی تووياڻ دەرئەكرد، من جحێل و بە (قُوّەت)بام، (مُعاونەت)م كردبای" (حضرەت) فەرمووی" ئايا دەرم ئەكەن؟" ووتی:"وا هاتیە، ئەوەی بەو تەرزە (رسالەت)ی (تبليغ)كردبێ دوژمنایەت كرایە" (وَرَق)ە دیارە، لە (مَشرَب)ی (قوم) زانیوتی، گەلێ لە گەورە گەورەكانی بە (قُوّەت) (إيمان)نایەنن، (عداوەت)ی (حضرەت)ی ئەكەن، (مَجْبوراً حضرة) (تَرك)ی (دار)و دیار ئەكا .

بەگوێرەی (نقل)ی (هیکل) بەگ، (ماجرا)ی (تَمثُل)ی (مَلَك) وە (إلقا)ی (آیات)ی (مَسرُودە) لەخەونابووە، لەفەرموودەی خۆی (هیکل) بەگ، وا دەرئەکەوێ، (خِلافی)یە، (قسم)ێ ئەفەرموون:" بە (خَبَر)بووە" (قسم)ێ ئەڵێن:"نوستووە، ئەوەی لە خەودا، دیوە"وەلە (عَلقمەی بنی قیس) (نَقل)ئەکا: لە (أوَّل)ەوە (أنبیا) (وحی)یان لەخەودا بۆ دێ، تا(قلب)یان (ساکنی) و بێ ترسی ئەبێ، ئەوجا بە(خَبَری) (وحی)یان بۆ دێ، (أمّا سیاق)ی (بُخاری) و (قسم)ێ لە (مُحَدِّثین) وا ئەگەیەنێ، (أوّل) و (آخر)، (وحی)ی (محمّد)(ﷺ)ی لە (یَقظَة)دابووە، من (شُبە)م لەوقسە نیە، وەکی (حضرەتی عائشە) ئەفەرموێ:" خەونی (صادِق)ی (رسول)ی (أمین) (قَبل الوحی)ی بووە"

(بَین)ێ (وحی)نەهات، (رسولی أکرم) (ﷺ) زۆر سەغڵەت بوو، (حَتّی قَصد)ی ئەکرد، خۆی لە چیا فرێدا، (مَعاذ الله إنتحار)بکا، ڕۆژێ ئەهاتەوە ماڵێ، دیتی لە (سَما) (مَلَك)ەکە، لەسەر (کورسی) دانیشتیە، (حضرەت)ترسا، بەگورجی چۆوە ماڵەوە، فەرمووی:"دام پۆشن"ئەنجا (آیات)ی (یا أیُّها المُدَّثِر) وەکی ڕابرد، (نازِل)بوو، کەوابێ، (أولاً) (أوائل)ی ئەم (سُورەت)ە، (بَعْدَة) (سورەت)ی (مُدَّثِر) (نازِل)بوە، وە (سورەت)ی (إقْرَأْ) هەمووی لە (أوائل)نیە، پێ ی (إلحاق) کرایە، وا دەرئەکەوێ (حضرەتی محمّد) (ﷺ) (أصلاً) لە(خیاڵ)ی (رسالەت) و (نُبُوّەت)نەبووە، (وهکذا) لە (حال)ی (موسی) و (إبراهیم) (علیهما السلام)دەرئەکەوێ وەکی (خَیالِیّون)آن نەبووین، خۆیان ئامادەبکەن، (مُنتظِر)بن، کەی (وَحی)یان بۆ دێ؟ (خلوەت)ی (رسالەت)ی (مُزَوِّر)یان لەبەر ئەکرێ، (صوفیّە) لەو(خُلوەت) دابوونی (حضرەتی)، (خلوة) کێشانیان کردیتە (ثمار)، (أمّا) إین کوجا و آن کوجا؟! (أوّلاً) ئی (حضرەت)ی (جَعْل) نەبوە، (مَیل)ی (قَلبِي)بووە، (ثانیاً) (حضرەت)لەو (خَلوە ت)ە دانەماوە، تا(آخر)ی، پاش (حُبّ)ی (خُلوەت) (وَحی) بۆهات، ئەوجا هاتە (مەیدان)ی (جلادەت)، تەك و تەنها، (مُقابل)ی (عالَم)ی (بشریەت) ڕاوەستا،

(مُلوك)ی (صاحب)ی (تاج) و تەختی، هێنا ژێر (أمر) و (إرادە)ی خۆی، (حقاً) جای (حیرەت)ە، لە (تأریخ)ێ وا (مُقدَّم) بۆ (ذات)ێ (أُمی) لە (قَوم)ێ (أُمّی)، لەشاری (أُم القُری) بە (أوّل) (آیة) (نازل)بێ، لە (خَلق) و (إیجاد)ی (إنسان)، لە (ذرّة)ی (حَیَویە)ی کەبەو لولەی دایکیا ئەنووسێ، تا ئەختێ گەورە ئەبێ، ئەبێتە پارەخوونێ، دوایە (أطوار)ی بەسەر دادێ، خوا ئەی کاتە ئەو (إنسان)ە، (تفسیر)ی (عَلَق)بەو (ذَرَّە)، ئەمڕۆ زۆر خۆشە، وە (مَعقول)ە .

(أوّلاً) بەناوی خودای (خالِق)، (ثانیاً) بەناوی خوداوەندی (أکرم)، بخوێنە، ئەو خودایەی، (تعلیم)ی (إنسان)ی کردیە، بە (قَلَم)، بۆ (تعلیم)ی (قلمی) (وصف)ی (أکرمیەت) زێدە ئەفەرموێ، (واقعاً أثر)ی (أکرمی) (جناب)ی (حق) کە (تکریم)ی (بَشر)ە، لە (تعلیم)ی (قلمی) و (خط) و (کتابەت) زۆر بە (قوەت) و ئاشکرایە، هەرچەند (نعمە ت)ی (نطق) زۆر زۆرە، وە (عامّیە) (لکن فائدە)ی (زیدە) لە (کتابەت)دایە، ئەگەر وانەبا، (عُلوم)ی (أوّلین) و (آخرین) چۆن دەگەیشتە ئێمە؟ (أحوال)ی (أنام)، لە (یوم)ی (تأریخ) تا ئەمڕۆ کوو ئەزاندرا؟ (أوّل) کەس (خطّ)ی دانا، کێ یە؟ بەڕاستی (معلوم)نیە، (مع الأسف) ئەو (أوّلیات)ە، بەڕاستی (قَلَم) (قَید)ی نەکردیە، (أمّا) ئەمڕۆ (عِلم)، بە (أوّلیات) ئاسانە، (بشر)–(خاصّە) (أجانب)–(قلم)یان (دائماً) لە (حرکە) دایە، (صغیر) و (کبیر)، (کُلّی) و (جُزئی) (غیر)ی (بِلاد) و (قوم)ی ئێمە، گورج (قید)ئەکەن .

(واقعە)یە لە (أقصی)ی (شرق) ئەقەومێ، پاشی دووسێ (دقیقە) لە (مُنْتَهی)ی (غرب) بە (جرائد)، بە (رادیۆ) بە (تەلەفۆن) (إعلان)ئەکرێ، وە (مُؤرِخ)ان لە (کتاب)ی (تأریخ) (قید)ی ئەکەن، خوداوەندی (أکرم)، (صاحب)ی (لوح) و (قلم)، هەروەکو (تعلیم)ی (إنسان)ی کردینە، ئەوی نەیزانیە، پێ ی زانانەدووە، (لایزال تعلیم)ی (بشر)ئەکا (حتّی بعض)ە (أُمور)یان زانیە، وە بە(عِلم)ی (عَمَلی)ی دروست، شتی وایان کردیە، کە (أوائل) بە (خیالّ)یاندا نەدەهات، وە ئێمەش تانەماندین، بە (مُحال)مان

(عد)ئەکرد، (أوّل) و (أخر)، (کرامەت)ی (بَشر) بە (عِلم)ە، (آدَم) لەسەر (مَلَك) بە (علم) (تَفَوُّق)ی کرد، (أما علم)ی (خیالّی)و (وَهمی) و (جَدلی)نا، (علم)ی خودای، (علم)ی (طبیعە ت)، (عِلم)ی (کیمیا)، لەگەلّ (عمل) و (إختراع)، (قیل) و (قال)، بیّ کەلّکە (مع الأسف) ئێمە، لەهەموو(علم)ی (ناقل)ببیّ، (مُقلّد)بن، (عملیات)مان نیە، وە لە (بلاد)ی (إسلام)ی (مکاتب) بەزۆری گوشادکران، وە (أنواع)ی (علوم)ی (عصری) و (غَربی)یان تیا ئەخوندریّ، وە (أکثر)ی (عنوان)ی (أستادان)، (دکتۆر) و (فیلسوف)یان پیّ درا، (أمّا) بۆ (إختراع) و (إنتفاع)، (أمّەت) (ألآن) (کان کما کان) بەلّکو پێش ئەو (إنقلاب)ە، (بعض)یّ (صنایع)مان هەبوو، خۆکردی بوون (نفع)ی بۆ خۆمان بوو، ئەوانیش لە قیس چوون، (عجایب) لەو (طرز)ە، (طرز)ی (قلم) (قلم)ی ولآتی خۆمان چەند جوان و چەند (محکم)بوو، مامۆستایەکان چەند شیرن دایاندەدا، ئەویش چوو، گۆڕیمانەوە، بە (قلم)ی مز و (قلم)ی تەنەکە، ئەو مەرەکەبە نازدارە فەوتا، مایە لووسی سووروشین هاتنە جێی، (واقعاً) تیّ شکاین وەك (مَثل)ی (فارس) ئەلّیّ:" سەنگین نەشودی، سەبوك چرای؟"نازانم بۆ وایە؟ تاکەی هەروا ئەبیّ؟ (قوم)ی (نجیب)ی عەرەب، لەسایەی خوداو (نَبی) (أُمّی) بوونە (صاحِب)ی (قَلم) و (کتابەت) و (مُسلك) و (سلطنە ت) و (خلافەت) و (قانون) و (شریعەت)، (یعنی) لەهەموو(جهە ت) (مُستغنی) لە (أُمم)ی تر بوو، (مع هذا) لەو (نِعمة)ە (عُظما)بە، (شُکر)نەکرا، (حتّی بعض)یّ لە (أُدبا)ی (عەرەب) چەندیّ لەمەوپێش بە (تقلید)ی (تورکان)، ئەیانویست، (حُروفات)ی (عربی) (تبدیل)کەن بە (حروف)ی (لاتینی)، ئەمە چیە؟ چی پیّ ئەلّێن؟ (حقّاً لسان)ی (عەرەب) لەهەموو(لسان)آن (واسع)ترە، (خط)یان لەهەموو (خط)ان خۆشترو جوانترە، هەندیّ (مخطوطات)ی (عەرەبی) (إنسان) ئەی نۆڕێنیّ، چاوی پیّ ڕوونـاك ئەبیّ، (عەرەب) چۆن (خط)یان پەیاکرد؟ چەند (دَور) و (طوِر)ی بەسەرهات، تا(زەمان)ی (عبدالحمید)ی (کاتب) گەیشتە ئەو (درجە)، (حقاً) لە (إیران)یش، لە (زَمان)ی (خُلفا)ی (عثمانی) (إعتنا)یان بە (خط)ی عربی

زۆركرد، (خطّاط)ی (عجیب)یان لیّ پەیابوو، ((مصر)یش باشە، گەرچی (سبب) بە (طبع)، (إعتنا) زۆر بە (خط) نەدراوە، وە (خط) خۆشی، بە (كِتابەت) گوزەران ناكا، زۆر كەس هەن، (خط)یان وەك جیّ ی جرنووكی پشیلەیە، لە (غایەت)، گەورەیی و (نِعمە ت) و خۆشی یە، گەلیّ كەس (خط)یان وەكی (دُر)ە، نانی دەرەیان دەست ناكەویّ، وەكی ئەلّیّن:" (قَلَمُ البليغ بِدُونِ خَط، مِغْزَلٌ)" بەلّكوو تەشی چاترە، بەخوری ڕیّستنی شتیّ پەیا ئەكا. بەلّیّ هەموو شت (طالِع)و بەختە، ئەوی (تورك)ئەلّیّ:"شانس"ئەو (حظّ)و بەختە، چیە؟ لە چیە؟ كەس نازانی، (إنسان)لەگەلیّ (جهەت) (مُحتاج)ە، بۆیە (أمور)ی (مُتَنوعّە)ی هیّنایتە (ساحە)ی (ظهور)، ڕووت(خلق)كرا، وە (مُحتاج)ی (لِباس)ە، چی كرد؟ بۆ (لباس)، (لباس)ی گەیاندە چ(درجە)؟ (محتاج)ی خواردنە، (زراعەت) و (طباخەت)ی بە چ (درجە)یەك گەیاند؟ (محتاج)ی خانەو، بنۆڕە (قصر) و (قصور)ی و باغات و (جنّات)ی، (محتاج)ی (قواعد)ە، چی كرد؟ لەڕیّ ی (تدوین)ی (علوم)و (قوانین) (إداری)و (سیاس)ی (محتاج)ی (حفظی) (مملكەت)و (توسیع)یەتی، چی كرد، چی ئەكا؟ بۆ (تَحَصُّن)ی ولاّتی، وە (إستیلا)ی (ممالِك)، ئەو (طبیعە ت)ەی چۆن وا (مُسخَّر)كرد؟ (خُلاصە) ئەوی كردی، (إحتیاجی)یە" (قوم)ی بۆ (دفع)ی (إحتیاجی) (سعی)نەكا بە (محتاجی) و (ڕەزیلی) ئەژیە، بە (ڕەزیلی) ئەمریّ، (إنسان) (محتاج)بیّ، خۆی بە (غنی)بزانی، (حِسّ)ی ئەو (نعمَە)انە ناكا، (حتّی كتابەت) بە (رزالەت) ئەزانی ﴿كَلاّ﴾ (مَنع)بن لەو (رزالەت)ە، بزانن(نعمەت)چیە؟ خۆتان بە (محتاج) بزانن، (سعی)كەن بۆ (دفع)ی (حاجەت). ئەی (قوم)ی خۆمان، ئیّوە (دقّەت)كەن (قطعە)ی (ئاوروپا) چونكی بە (طبیعە ت) (غنی)نیە، (فقیرە)، بە (صناعەت) چەند دەولّەمەند بوو؟ چۆن (غَلبە)ی بەسەر (ئاسیا)دا كرد؟ (ئاسیا) (طبعاً غنی)یە، (أمّا) (مَعَ الأسف) (صناعه فقیر)ە، تادیّ (فقیر)تر ئەبیّ،بەس (ژاپۆن)یان هەیە، بەناوبیّ، (نوعاًما) (مُقابَلە)ی (غرب)بكا، چونكی ئەو (قَدر)ی (علم)ی (عملی) ئەزانی، (سعی)ئەكات، بۆ سەركەوتن و پیّش

کەوتن، گشتیان تیّ ئەکۆشن ﴿إِنَّ الإِنسَانَ لَيَطْغَى﴾ (تجاوز) لە (حد) ئەکا، (قدر)ی (علم) نازانیّ، بە (جَهل) (إفتخار)ئەکا، تاکوولیّی ئەقەومیّ، ئەوجا (نادم) ئەبیّ، (أمّا)بیّ (فائدە)یە، (إنسان)ی ناهەموار (طُغیان)ئەکا ﴿أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى﴾ خۆی بە (مُستَغنی) ببینی، (إستغنا) بۆ (رۆح) وەکی (موادّ)ی (بەنج)ە، (صاحب)ی (حِسّ)ی هیچ ناکا، (مُتَألِّم)نابیّ، (حتی إنسان)وای لیّ دیّ، (تحقیر)ی ئەکەن، تیّ ی هەلّ ئەدەن، شەقازلەی لە پشتی ملیی ئەدەن، گەوادو دەویت و تەرەسی ئەکەن، پیّ ئەکەنیّ (کیف)ی پیّ دیّ، گۆی یا ئەمە: (صُحبەت)ە، (لطیفە)یە، گەمەیە، ئی (مُستغنی) (دەعیە)ی نایّنیّ، فیّرە (کتابەت)بیّ، میرزایە بە (کریّ) ئەگریّ، وەکی خزمەتکاران وە زۆر بەبیّ (حُرمەتی) ئەی نۆرپّتیّ، ئەی (قَوم) ئیّوە (حِسّ) (إحتیاجی)بکەن بۆ (دَفع)ی بەتەواوی (سَعی) بە جیّ بیّنن، (دَرك)ی (أَلم) و (زِلّة)کەن، خەریکی (عَلاج)ی بن، (عِلم)تان لا بە (حُرمەت)بیّ، دوای (أوهام) و (خیالات) مەکەون، ئیّوەش وەکی من ئەبینن، بابم (عَلَیه الرَّحمه) (وَصیَّه ت)ی لیّ کردم: فەرمووی:"رۆلّە (تحقیر)ی نووسراوی مەکە، هەرچی هاتە بەرچاوت بیخوونەوە، (وَلَوْ) (حکایەت) و مەتەلّۆك بیّ" (واقعاً) لەو (وَصیَّه ت)ە زۆر (مُستفید)بووم، پیّشی (حرب)ی پیّشی، (ملا عبدالرحمن) ناویّ (پشدەری) لای من (إبن حجری) ئەخویّند، لە (بحث)ی (قتل)ئەی فەرموو:"ئەگەر کەسیّ زەهریّ کەم، بە (طریق)ی دەم، (یعنی) زار- بداتە کەسیّ وە بمریّ، (دِیَة)ی لەسەرە، ئەگەر بەدەرزی لەرانی-(مثلاً)- کەمیّ زەهر (داخل)کا، وە بمریّ، (قِصاص)ی لەسەرە"بۆ؟ (سبب)م نەزانی تا (مُدە)یە، لە(مجلّە)ی (ثَروة فُنون)ی (تورکی)م دادیت، ئەی ووت:"دوو دقتۆر (مُنازعە)یان بوو، یەکیّ ئەی ووت: هیّلکە زەهری هەیە بۆ؟" چونکی ئیّمەبۆ مەرهەمی برین (إستعمال)ی ئەکەین، وە برینەکە کیّم ئەکا، ئەوە لەبەر زەهری هیّلکەیە" ئەویتر ئەی ووت:"ئەگەر وابیّ، (لازم)ە (أهل)ی (پاریس) هەموو بمرن، چونکی هیّلکەی زۆر ئەخۆن" (جواب)ی دا:"زەهری هیّلکە کەمە بە (طریق)ی (فَم) (مُدافِع)ی هەیە

(حرارەت)ی (مَعدە) و (کَبد) و هەناسە (دَفع)ی ئەکا، (أمّـا) لـە (خـارج)دا، بـیێ (مُدافعە)، زوو ئەکەوێتە ناو خوێن بە (فسـاد)ی ئـەدا" لـەو (مُحـاوَرە) مـن ئـەو (مسـئلە)ی (شـرعیە)م، بـۆ (حَـل)بـوو ئـەڵێن:"(إنسـان) گـەلێ (صـنایع)ی لـە (حَشـرات) و (حیوانـات)ی وەرگرتیـە، لـە (حیوانـات) زۆر شـت فێربـوە" لـە (تُحفە)ی (طِبـی)ئـەلێ:" پڵـنگ بـەزان زۆر (مُتـأثر) ئـەبێ تـاکو جارێتر ئـاوس نەبێ، ڕەگی گیایەکی ئەخوا، (عقیم)ئەبێ".

(إنسـان) لـەوەی زانیـان ئـەو ڕەگـە گیایـە، مـێ (عَقـیم)ئـەکا، (مـانع)ی (حَمل)ە.(دقەت) لە (إنسان)کە، چەند (سـعی)کردیـە، تـا فێربـووە، (تعلـیم)ی خوایی (أنواع)ی هەیە (قِسم)ێ بە (وَحی)یە، (قسم)ی (غریزی)یە، (قِسم)ی لـە (تجـارُب) زاندرایـە، (عِلـم)ی (نباتـات) وابـزانم (سـبب)ی برسـیایەتی بـووە، (حُکما)ی (یونان)، وەکی: (أفلاطون) و (أرسطو)، (فیثاغورس) و (إقلیدوس) و (جـالینوس)، بـە (فکـر) و (تصـوّر) و (تأمّـل) گـەلێ (عِلـم)یـان (تَـدوین) و زۆر (خَفا)یان دەرخست، گەلێ شت هەیە، ئێمە نـازانین، (إنسـان)ی پێشـوو کـووی زانیوە؟! ئەز (جُملە) دۆشاوی ترێ، گڵێ هەیە سـپی، مسـتەکی ئەهاوێنـە نـاو مەنجەڵی ئاوی ترێ ی کـولاّی، (غـیر)ی (مـادّە)ی (سـکری) (مَـوادّ)ی تـر فـرێ ئەدا، شیرن ئەبێ، وەکی هەنگوین، نازانم (مِفتاح)ی چیە؟

﴿إِنَّ إِلَـى رَبِّـكَ﴾ (یـا مُحمّـد) (ﷺ) (لاشـكَّ) ئەمـە (ظـاهر)ە، (إنسـان) لـەو (مقام)ە دا (حقّ)ی (إلتفات)ی نیە، گەرچی بڵێین:" بـۆ (تَهدیـد)ە" بەڕاسـتی و دروستی، هەر بۆ لای خوای تۆیە ﴿الرُّجْعَى﴾ گەڕانەوە، بـەمردن، بـە (بعـص)، بۆلای کەسـیتر نیـە ئـەو (طـاغی) و (بـاغی)یانـە، (جَـزا)ی خۆیـان لـە خـواوە وەرئەگرن، بنۆڕە (آثار)ی (طُغیان) یـەکێ لـە (آثـار)ی، (نَهـی) و (مَنـع)ی خـوا پەرسـتانە، لـەخوا پەرسـتین ﴿أَرَأَیْـتَ الَّـذِی﴾ دیتیتـە؟ ئـەوی ﴿یَنْهَـى﴾ (ظاهر)وەیە، بە (إستمرار)بێ ﴿عَبْدًا إِذَا صَلَّى﴾ (خَبر)م دەیە، ئـەی (رائـی) لـە (حال)ی ئەو کەسە، ئەوە چیە؟چۆن ئەبێ؟ (عَبد)ێ بە (عباد)ی خوا نوێژ بکا، (رَبّ)ی (أنام) بپەرستێ، (شخص)بـێ (نهـی)لـێ بکـا: نـابێ نوێـژ بکـەی، نابـێ

خوداوەندی (كائنات) بپەرستی، ئەڵێن:" (أبو جهل) سوێندی-خوارد بە (لات) و (عُزّی)، ئەگەر (محمّد)ی(ﷺ) ببینێ نوێژ بكا، پێی لەسەر ملی دادەنێ ڕووی لە خۆڵێ وەرئەدا"ڕۆژێ دیتی، نوێژی نیوەڕۆی ئەكرد، چووكە سوێندەكەی بەجێ بێنی، كەچی دیان (أبو جهل) پاشەو پاش ئەگەڕێتەوە، وە بەدەستی خۆی ئەپارێزێ، (سؤال)یان كرد"بۆ وا گەڕایەوە، چت ئەكرد؟"ووتی:"لە (بَین)ی من و وی، (خَندەق)ێ بوو، لە ئاگر، وە (أهوال) و (أجنحە) هەبوو" پێغەمبەر فەرمووی:"ئەگەر لێم نێزیك بوویا، (ملائكە) پارچەپارچەیان ئەكرد، (أعضا)یان لەبارێەك دێنا دەر"ئەوە(نَهی)یە (عَملی)یە، (أمّا ظاهر)وەیە، بە (لَفظ)یش (نَهی)كردبێ .

بۆ (سَبب)ی (نُزول) (حكایەت)ی دی ئەكەن، گۆی یا (حضرەتی رسول) (ﷺ) نوێژی بە (جَماعەتی)كردیە، (أبوبكر) و(علی) لە (خدمەت)ی دابووین، (أبو طالب) بە لایانا تێ پەڕی یە، (جعفر)ی كوڕی لەگەڵ بووە، فەرموویەتی:"بڕۆ لە (جناح)ی ئامۆزات، نوێژبكە" (أبو طالب) ئەگەڕێتەوە بە (مَسروری)وە چەند (شیعر)ێ ئەڵێ، دوایە (أبو جهل)ی دیوە دەگەڕێتەوە، (أمّا) (سیّدی آلووسی) ئەڵێ:" ئەمە (نَظری) تیایە، چونكی نوێژ لەشەوی (معراج) (فرض) كرایە، بە ساڵێ وەیا ساڵێ وە چەند مانگ، سێ یا پێنج، پێش (هجرەت) وە (وفات)ی (أبو طالب) بەسێ ساڵ پێش (هجرەت)بوە، وەسێ یابە پێنج ڕۆژ، (مُقدم) لە (حضرەتی خدیجە) (وَفات)ی كردیە كەوابی (أبو طالب) نەگەیشتیتە (وەقت)ی (وَجوب)ی نوێژ" ئەمەوا، (رسول الله) (ﷺ) بە (وفات)ی مامی و (حَرَم)ی زۆر (محزون) و كزبوو، بێ یاروەیاوەر ماوە، (قُریش) (زێد)ە (عذاب)یان ئەدا، (حتّی) (دفعة)یە فەرمووی: (وَالله) ئەو (شَیْئە)ی ئەم (كەڕهان)، لە (طرف) (قریش) نەگەیشتە من، تا (أبو طالب) (وفات)ی كرد"، (جسارەت)یان بە (درجە)یە (واصل)بوو، (دَفعە)یە جەماتێ لەگەڵ (أبو جهل)بوون، دیتیان (محمّد) نوێژ ئەكا، (أبو جهل) ووتی:"كێ مندالّدانی حوشتری سەر نەبڕای كوژرای (بنی فلان)ی، لەگەڵ پیسای بێنی،

بێ هاوێتە سەر پشتی (مُحمّد)ی" (أشْقی اَلْقَوْم) (عَقَبەی بن مَعیط) چوو هێنای، هاویشتیە ناوشانی (محمّد)ی (ﷺ) لە (سجدە)دا، (عبدالله بنی مسعود)ئەڵێ:" من نەمتوانی چ بکەم، (قوم) پێ ئەکەنین، خۆیان ئەهاویشتە سەریەك، (رسولی أکرم)یش (ﷺ) سەری بڵند نەدەکرد، تا (فاطمة)ی کچی هات، لەسەر پشتی لادا" بەڵێ بێ (قُوّەتی) و بێ یار و یاوەری هەمووشت بەسەر (إنسان) دێنێ.

(ملا)یان قسەیان فەرمووە، لە (إستمرار)ی (رسولی أکرم) (ﷺ) لە نوێژدا، وە لەسەر خۆشی لانەدایە، نوێژی گێڕایتەوە، یان نا؟ یا ناوزگ و (فَرث)ی (حیوانات)ی (ماکول) پیس نیە؟ (حتّی)((نَوَوی) ئەفەرمووێ:" پێغەمبەر (ﷺ) (حِسّ) نەکردیە، کە ئەو (أنجاس)ەی لەسەر، گۆی یا لەبەر (إسغراق) لە (حضور)ی (حق)" (اَلحَقْ) قسەیە بێ(معنا)یە، من لام وەیە، ئەوەندە (سجدە)ی (حضر ەتی محمّد) (ﷺ) لەو(حاڵ)ەدا، هەزار نوێژی بە (طهارەت) ئێنێ، (دوام)ی لەو (حاڵ)ەدا، زێدە نواندنی (مَزلُەت)ی خۆی بوە، لە (حضور)ی (کبریائی)، بۆیە کەسەری بلند کرد، (دُعا)ی لێ کردن (إبن حجری عسقلانی) لە (شرح)ی (بخاری) لێرە (سؤال)ێ ئەکا:"بۆچی (أبو جهل) بە (نَوع)ەی کە (ذِکر)کرا، (منع)بوو لە (أذیەت)دانی (حضرەتی محمّد) (ﷺ) ی؟ بۆ (عَقَبە) بەهیچ (وجە) (مَنع)نەکرا؟، چ باڵ و (أهوال) و (خەندەق)ی ئاگریٚ بۆ (ظاهِر) نەبوو؟" (جواب)ێ ئەداتەوە، لام خۆش نیە، (جواب)ی ڕاستی ئەوەیە: ئەمەش هەر لەمەڕ (أبو جهل)ی بووە، بە (مؤامرة)بوو، دیارە ئەوی لە هەموان کەمتربوو، ئەو منداڵ دانی فرێ درای هەڵ گرتیە، وە هێنایتی، (أبو جهل) و ئەوانیدی ئەو(تَنَزّل)ەیان نەکردیە، چونکی (جسارەت)ێ (دنائەت) کارانەبووە، (أهمیەت)ی نەدراوەتێ، ئەگەر خۆی (بِالذّات) (قصد)ی (إیذا)ی (رسول الله) (ﷺ)ی کردبا، (ممکن)بوو لە (أبو جهل) زێترە بترسێندرێ، ئەوە بزانن (رسول)ی (مُجْتَبّا) لەڕێ ی خودا، چ (آلام) و (أذیة) و (خفارەت)ی چێشتووە، وە (قبول)ی کردیە ! ئەگەر (أجل)

